# یـــــادەوەریـیـەکـــانـی

## کچە کوردێکی ئەنفالکراو

ڕۆمان

نووسینی:
سەدرەدین محێدین کەڵوپیی

چاپی شەشەم

سلێمانی ــــــــــــــــ ٢٧٠٩کوردی

٢٠١٠ ز

(١)

بەفرانباربوو،گوندەکەمان تارای زیوینی پۆشی بوو , دیمەنی بە یەککگەیشتنی هەور و لوتکە ، کپی و بێدەنگیان، ئارامییان دابووە ئەو دەڤەرە، ببووە مایەی خۆشی بۆ دڵەکان، بە تایبەت ئەو دڵانەی خۆشەویستییان بە یەکدی ڕادەگەیان و دەیانگۆڕییەوە.

منیش ئەو ڕۆژە دڵخۆشبووم، کە ( نەریمان ) ی شوانمان لە ماڵ دەمێنێ و ناچێ بۆ لەوەڕاندنی مەڕەکان . هەستم دەکرد بە بینینی، چاو و دڵم ڕوون دەبێتەوە، لێدانی دڵ، خۆشیێ دەبەخشێ بە شادەمارەکانی جەستەم ، لە ناخی دڵەوە خۆشمدەویست ، لە کاتی دۆشینی مەڕەکان، بە کەمەی گۆچانەکەی مەڕەکەی بۆ دەگرتم ، ڕەنگی شەرماوییمان لێدەنیشت، زەردەخەنە دەبووە میوانی لێوەکانمان ، چاوەکان پڕ لە ئاو دەبوون ، نەماندەزانی چیی بە یەکدی بڵێین ، زمان بە دوای ووشە دەگەڕا، نەیدەدۆزییەوە، حەزم نەدەکرد کۆتایی بە دۆشینی سەد سەر مەڕەکەمان بێ ، ئەو جێژوانە پڕ سۆز و خۆشەویستییە کۆتایی پێبێ.

شەویٚ لە چاوەڕوانیی ئاوازی شمشاڵی دەسی بووم , وەك نەریتێکی ئاسایی شەوانە، نامەیەکی عیشق و سۆز و خۆشەویستیی بۆ دەناردم و منیش فرمێسکی خۆشەویستیم دەبارانە سەری. جێژوانی بەیانی زوومان، بردنی خواردنی ژەمی بەیانی بوو بۆ ژوورەکەی, تەماشای سەراپای دەکردم ، ختوکەی بە لەشمدا دەهێنا و زەردەخەنەی دەخستە سەر لێوانم , نەمدەتوانی ئەو وشانەی کە شەو چەن جاریٚ دووبارەم دەکردەوە دەریبڕم، تەنیا دڵ و چاومان بە یەکدی ڕوون دەبوونەوە، بە دەنگیٚ نەوی، بە شەرمەوە دەیگوت: ئاوازی ئەم شەو چۆن بوو؟!!

دەمگوت: زۆر خۆشبوو، دەست خۆشبیٚ ، دەڕۆیشتم و تا دووردەکەوتمەوە چەن جاریٚ ئاوڕم لێدەدایەوە.

باوك ودایك و برا تاقانەکەم زۆر خۆشدەویست ، لەبەر ئەوە خۆشەویستییەکەمان بێدەنگ و پاکوبێگەرد بوو ، وەك خۆشەویستیی هەور و لووتکەی چیا وابوو.

ئەو شەوە لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە سەیری دەرەوەم دەکرد، ڕەنگی زیوینی، تاریکی شەوی داپۆشیبوو , ئاوازی شمشاڵی دەسی نەریمان، ئەو دەڤەرەی بێدەنگ کردبوو ، گوێیان هەڵخستبوو بۆ ئەو ئاوازە پڕ سۆز و عیشقە کە خۆشەویستیمانی بۆ دەشت ، دۆڵ ، هەور و لووتکە دەگێڕایەوە . چوومەوە سەر

جێیەکەم ، فرمێسکی خۆشەویستیم بۆ دەڕژان، لەگەڵ ئاوازەکەیدا دەسلەملانێی یەکدی دەبووینەوە.

بەیانی چوومەوە بۆ ژوورەکەی ، گوتم : دەزانی ئاوازەکەی ئەم شەو زۆری گریانم!!

گوتی: وابیٚ ئیدی شمشاڵ ناژەنم.

گوتم: نەکەی من لەو ئاوازانە بکەی ، ئاوازەکان دایکیٚ دیکەی شەوانەی منن ، بە لایلایەکەیان دەنووم .

گوتی: دڵنیابە لەگەڵ ناردنی هەر ئاوازیٚ ، شمشاڵەکەم ئەشك باران دەکەم . سەرنجێکیدام، هێندیٚ بێدەنگبوو و گوتی: دەزانی (نەسرین) گیان زۆرم خۆشدەوێی !! بەو ووشەیەی، کە لە مێژبوو چاوەڕوانیی بووم , فرمێسکی سۆز و عیشقی لێبارانم , زۆر بە سەرسوڕمانەوە دەیگوت : بۆ دەگری؟!!

لەگەڵ گریانەکەم ، زەردەخەنەیەکم بۆ کرد و بە پەلە چوومە دەرەوە ، دەترسام نهێنییەکەمان ئاشکرابیٚ.

بۆ دووەم بەیانی چوومەوە، بە پەرۆشەوە هەستا و گوتی: ئەم شەو نەنوستووم ، گریەکەی دوێنێت سۆزێکی زۆری پێبەخشیم، نەسرین گیان، من تۆم خۆشدەویٚ ، ئەی تۆ منت خۆشدەویٚ ؟!!

گوتم: ( نەریمان ) گیان، گریانەکەم گریەی خۆشەویستیبوو ، چاوەکانم وەڵامیان پێبوو، بەڵام زبان وەستابوو ، تۆم خۆشدەویٚ، خۆشەویستییٚ پاکوبێگەرد . دەسی لە دەسم نزیککردەوە، پەنجە

لەرزۆکەکانمان تێکەڵبوون، بەڵام خۆشەویستیم بۆ ئابڕوو, بۆ خێزانەکەم بە هێزتر بوو، بە هێواشی دەسم لە نێو دەسی دەرهێنا.
ئەو ڕۆژە بۆ ئێواریێ، لە چاوەڕوانیی دۆشینی مەڕەکان بووم، تا جێژوانێ دیم بۆ دروسبێتەوە ، لە کاتی دۆشیندا بە تیلی چاوان تەماشای یەکدیمان دەکرد، بە هێمنی گوتی: (نەسرین) گیان،دەبێ بۆ یەکدی بین؟!!

گوتم: دڵنیابە، یا بۆ تۆ دەبم یا بۆ گڵێ، لەو کاتە توانای گرتنی مەنجەڵە شیرەکەم نەما و ڕژا، دڵم زۆر ترسا ،جگە لەوەی شەرم گرتمی!!

( نەریمان ) گوتی: ڕووناکییە.

گوتم: بیستوومە ئاو ڕووناکییە.

لەو کاتە باوکم هات، بینی شیرەکەم ڕژانووە و شپرزە بوومە، گوتی: گوێ مەدەرێ ئەویش دەبێ . هەردووک، شەرم گرتبووینی, کە باوکم دوورکەوتەوە ، ( نەریمان ) گوتی: منیش دەڵێم گوێ مەدەرێ, هەر شەوێ ئاوازێ خۆشت بۆ دەنێرم تا لە بیرت باتەوە،

گوتیشی نەسرین گیان، وورەم نەماوە ، گەر ڕازیبی، سبەی دەچم بۆماڵی خۆمان، بە باوکم دەڵێم،بێت و داخوازی تۆم بۆ بکا.

گوتم: ( نەریمان ) گیان، منیش حەزدەکەم، بەڵام ماڵەوە زۆر پێویستیان بە منە ، دەترسم باوکم ڕازی نەبێ، تۆش جێمبێڵی و ئیدی شوانیمان نەکەی.

گـوتی : هـیچ خـەمت نـەبێ، هـەر لـەم نزیکـە، خـانوویێ دروسـدەکەین و تێیـدا دەژیـن ،مـن هـەردەبم بـە شـوان ، تـۆش لـە خزمەتی ماڵی باوکت بە.

گوتم: منیش زۆر حەزدەکەم، بەڵام دەبێ سبەی بچی بۆ ماڵی خۆتـان و شـەو بێیتـەوە ، چـونکە شـەوانە بـێ ئـاوازی شمـشاڵت، خەوم لێناکەوێ.

گوتی: گەر نیوە شەویش بێ دێمەوە!!

بۆ سبەی چووە لای باوکم و یارمەتیی وەر گرت و ڕۆیشتەوە.

ئەو ڕۆژە تـا نزیك ئێواریێ چاوەڕوانبووم،هەر نەهاتـەوە، چوومە سـەربان و سـەیری ڕێیـەکانم دەکـرد، لـە ناکـاو ( نـازەنین ) ی دراوسێمان، کچی ( مەلا ئەحمەد ) مـەلای گوندەکەمان، بۆ سـەربان هات، گوتی: تەماشای چیی دەکەی, چاو بۆ کێ دەگێڕی؟!!

گـوتم:( نـازەنین )، نـازانم، وا درەنگـی کـرد،( نـەریمان ) هـەر نەگەڕایەوە.

گوتی: خۆزگەم بە خۆت،کە لە چاوەڕوانیی خۆشەویستت دای.

گوتم: دەنگت نەویکە, ئەم نهێنییە تەنیا تۆ دەیزانی.

گـوتی: دڵنیابـە،لای مـن نهێنیـێ پـیرۆزە, هـیچ خـەمت نـەبێ هـەر دێتەوە. لەوکاتە، باوکی ( نازەنین ) لە مزگـەوتی گوندەوە ، بـانگی ئێـوارێی دەفـەرموو، هـەردووکمان سـەرنجێ دیکـەی ڕێیەکەمانـدا، بەڵام بە نائومێدی چووینە خوارەوە.

شەو تاریکی کرد، چەندینجار چوومە لای پەنجەرەی ژوورەکەم، هەر دیار نەبوو، بە ناچاری لە سەر جێیەکەم ڕاکشام. ماوەیەکی پێچوو، بە دەنگی شمشاڵەکەی بە ئاگا هاتم وشەوباشی لێدەکردم.

بەیانی چووم بۆ ژوورەکەی، گوتی : هەر ئەوڕۆ باوکم دێ.

نزیك نیوەڕۆ بوو، (نەریمان ) لە ڕان بوو, باوکی هات و لەگەڵ باوکم دەسی یەکدیان ماچ کرد. چوومە ژوورەکەی باوکم و خێرهاتنی باوکی ( نەریمان ) م کرد ، ئەویش ڕوانییە سەراپام گوتی: ڕوو سپیی بی کچم  زۆر بە شەرمەوە هاتمەوە ژوورەکەی خۆم و چایەکەم بە سەر دایکم جێهێشت.

کاتێ باوکی ( نەریمان ) باسەکەی کردەوە، باوکم گوتی: حەزدەکەم ،بەڵام گەر ئەم کچەم بە شوو بدەم، کێ کاری نێو ماڵ بکا؟!!

دڵم ناخۆشبوو و گوتم: ( نەریمان ) گیان، پەلەی چییت بوو.

باوکی نەریمان گوتی: کچ هەر کچی خۆتە, کوڕ کوڕی خۆتە، هەر لە نزیك ماڵی خۆتان خانوویان بۆ دروسدەکەین

ئەم قسانەی کرد، زانیم ( نەریمان ) بە باوکی گوتووە کە وابڵێ.

باوکم گوتی :وابێ زۆر باشە، بەڵام دەبێ ڕەزامەندیی کچەکەم وەرگرم ،تا دوو ڕۆژێ چاوەڕوانبن، گەر ڕازی بوو، مارەیان دەکەین و نزیك بەهار بیگوازنەوە، بەڵکو منیش لەو ماوەیە بتوانم ژنێ بۆ (ڕێباز ) ی کوڕم بێنم. هێند دڵخۆشبووم، خەریك بوو هاوار بکەم و

بڵێم (بابە گیان من ڕازیم). باوکی ( نەریمان )، بە پەلە هەستا بۆ دەس ماچکردن، لەبەر ڕازی بوونی باوکم. پاش نیوەڕۆ باوکی(نەریمان ) ڕۆیشتەوە.

باوکم بانگیکردم بۆ ژوورەکەی خۆی و گوتی: کچەکەم دەزانی باوکی ( نەریمان ) بۆچی هاتبوو؟

بێدەنگبووم، شەرمم دەکرد وەڵامی بدەمەوە، هەر خۆی گوتی: بۆ خوازبێنی تۆ هاتبوو بۆ ( نەریمان ) ی کوڕی , کچەکەم , نەریمان کوڕێکی زۆر باشە, لە (ڕێبان) دڵسۆزترە، گەر ڕازی بی، دوو ڕۆژی دی وەڵامیان دەدەمەوە.

گوتم: بابەگیان، تۆ باوکمی، هەرچی بڵێی، دڵنیابە من ڕازیم.

سەری ماچ کردم و گوتی: یاخوا هەر تەمەن درێژبی و خوا بتپارێزێ. منیش دەسەکانیم ماچ کرد. بەڵام دایکم ویستی کۆسپ بکاتە ڕێی شوو کردنەکەم, ناهەقی نەبوو، چونکە تەنیا من لە ماڵ بووم، باوکم گوتی: خەمت نەبێ ژنەکە، دڵنیابە بە دڵی تۆ دەبێ. لە شەرما، بە پەلە چوومە دەرەوە.

ڕێبازی برام، مەسەلەکەی زۆر پێ سادەبوو، کوڕێکی ژیرو ڕۆشنبیربوو، چونکە تێکەڵ ببوو لەگەڵ ڕۆشنبیرانی شۆڕشی گەلەکەمان.

کە ( نەریمان ) ئێواریێ هاتەوە لە ڕان ، هەر لە دوورەوە بە هێمایەك تێمگەیاند،( باوکی هاتووە و باوکم ڕازی بووە) .

نەیدەزانی لە خۆشیان چیی بکا.

بۆ دووەم ڕۆژ باوکم بانگی ( نەریمان ) ی کرد ، منیش لەو کاتە لە نزیکیانەوە پەچەم دەماڵی ، هەموو هەستم لای ووشە بە ووشەکانی باوکم و نەریمان بوو.

گوتی: کوڕم، ئێمە بە ڕاستی تۆ دەکەین بە کوڕی خۆمان, ئێستە بچۆرەوە بۆ ماڵی خۆتان و بە باوکت بڵێ بێن بۆ جێبەجێ کردنی مەسەلەکەمان ، ئەویش بە پەلە دەسی باوکی ماچ کردم و خۆی ئامادەکرد بۆ ڕۆیشتن.

لە پاش دوو ڕۆژ، ماڵی باوکی نەریمان بە خزم وکەسوکاریانەوە هاتن ، مارەیان کردم و شیرینیمان بە گوندەکەمان دابەشکرد.

پاش مارەکردن، بە شەرمەوە سەیری ( نەریمان ) م دەکرد، ئەویش بە هەمان شێوە شەرمی دەکرد، بە تایبەت لە باوکم.

جاروبار بە نهێنی قسەمان دەکرد، ( نەریمان )دەیگوت: سەبرم نەما.

دەمگوت: پەلە مەکە، زۆرمان نەماوە بگەینە بەهار، بە دڵنیاییەوە لە بەهاردا دەچینە کەژاوەی هاوسەرێتیی، تەنیا مەگەر مردن لێکمان جیا بکاتەوە.

( ٢ )

سات ، ڕۆژ ، هەفتەو مانگم هەژماردە دەکرد, ئاخۆ چ کاتێ، من و نەریمان بە چوونە کەژاوەی هاوسەرێتیمان شادەبین, پتر تیلی چاوەکانمان، بینینی دزە نەکەن بۆ تەنیا تەماشایەکی یەکدی, لە نزیکەوە بۆ ئاوازی شمشاڵی دەسی گوێ ڕادێرم تا مێشك و دڵ ودەروونم ئارام بکاتەوە, جگەر گۆشەکانمان جوانترین و پیرۆزترین ووشەی ( دایك ) م پێبەخشن ، منیش ببم بە دڵسۆزترین ( دایك ) کە لە مێژە تامەزرۆی دایکایەتییم و هەموو ئاواتێکمە.

ئەو ئێوارەیە دڵمان زۆر تەنگبوو ، نەك تەنیا خێزانی ئێمە هەموو ئاوایی, نەك هەر ئاوایی ئێمە دەوروبەر هەموو.

تیپێ پێشمەرگە هاتنە ئاواییەکەمان کە لە خوارەوە هاتبوون، خەڵکی گوندەکەمان بە ژن ، منداڵ ، پیر و گەنجەوە چووینە پێشوازییان بۆ وەرگرتنی دوا هەواڵ لە دڕندایەتیی سوپاکەی ڕژێم بەرانبەر خەڵکی بێ تاوانی گوندەکان.

کادیرەکە قسەی بۆ دەکردین ، وورەی خەڵکی بەرزدەکردەوە و دەیگوت: دڵنیابن هێزەکانمان بەرەنگارییان دەکەن و ناگەنە ئەم ناوچانە و سوپای ئەنفال لە ناودەبەین. ( مەلا ئەحمەد ) یارمەتیی

لە کادیرەکە وەرگرت، تا ووشەی ئەنفال ڕوون بکاتەوە، کادیرەکە زۆر بەڕێزەوە فەرمووی لێکرد. ئەویش گوتی:خەڵکینە، دەزانن مانای ووشەی ئەنفال چییە و لە چ سەردەمێکدا بووە؟!!

" لە سەردەمی شەڕی نێوان موسڵمان و کافرەکاندا بوو، موسوڵمانەکان ڕێگەپێدراو بوون بە تالآنکردنی سەرو ماڵی کافرەکان وفرۆشتنی کچان و ژنانیان وەك جاریە .

کادیرەکە گوتی: فەرموودەکەی مامۆستا زۆر ڕاستە ، ئەم ڕژێمە دڕندەیە خۆی بە موسڵمان دەزانێ و ئێمەی کوردیش بە کافر!!

هێندێ لە خەڵکی گوندەکەمان گوتیان: وا چاکە ڕەوکەین وئاوایی جێبێڵین، با تووشی سوپای ئەنفال نەبین . کادیرەکە گوتی: ڕەو مەکەن و وورەی گوندەکانی دەوروبەر مەڕوخێنن، باوەڕتان بە هێزی پێشمەرگە هەبێ، کە بەرەنگاریان دەکا.

ئەو شەوە هیچ کەس خەوی نەبوو ، شەوی دواتر هەر بەوشێوەیە بوو, لە شەوی سێیەمدا ، سوپاکە بە تەواوی نزیکی ئەو دەڤەرە بوەوە .ماڵی ( مەلا ئەحمەد ) خۆیان کۆکردبوەوە بۆ ڕۆیشتن, هات بۆ لای باوکم و گوتی : گەر بە قسەم دەکەی، ئێوەش دێن و خۆتان لە بەڵای سوپای ئەنفال دەپارێزن

باوکم گوتی: مامۆستا ،چۆن بتوانم کە من خاوەنی مەڕ و ماڵاتێ زۆرم؟!!

( مەلا ئەحمەد ) گوتی: گەر بێی، بە هەمووان مەڕ و مالاّتەکە دەدەینە پێش و تا سنوورەکان ناوەستین

( نەریمان ) گوتی: مامە گیان، دەتوانین مەڕ و مالاّتەکە زۆر بە ئاسانی بدەینە پێش.

( ڕێباز ) ی برام گوتی: لە چیی دەترسن، دڵنیابن هێزی پێشمەرگە بەرەنگاریان دەکا.

دایکم گوتی: کوڕەکەم، پێشمەرگەکان چوون بەرەو سەرووتر، دڵنیابە بەرەنگاریان نەماوە بەرانبەر ئەم هێزە بێ شومارە، کە (جاش ) یان لەگەڵ دایەو ڕێیان بۆ ئاسان دەکەن و لە پێشی پێشەوەن.

( ڕێباز ) گوتی: ئەوانە خۆ فرۆشن ، ڕۆژێ دێ بە سزای گەل و شۆڕش دەگەیەنرێن.

بە تیلی چاوم سەیرێکی ( نەریمان ) م کرد، کەوتبووە نێو دەریای خەیاڵەوە و بێ ئومێدییم لە چاوەکانی بەدی دەکرد ، زۆر بەزەییم پێدەهاتەوە و گریانم بۆی دەهات. باوکم بە ( نەریمان ) ی گوت: چیی دەڵێی کوڕم ، ئەویش بێ ئەوەی بزانێ پرسیاری باوکم چیی بوو، گوتی: مامەگیان چۆنت پێباشە وا بکە.

( ڕێباز ) گوتی: بابەگیان، گەر ئێوە بڕۆن من نایەم ، خۆم دەگەیەنمە هێزی پێشمەرگە و بەرەنگاری سوپاکەی ڕژێم دەکەم.

باوکم گوتی: وابیّ مامۆستا ماڵت ئاوەدان بیّ ، ئێوە بڕۆن، بەڵام ئێمە ناتوانین.

ماڵاوایییان لێکردین، منیش لەگەڵ ( نازەنین ) دەسمان لە ملی یەکدی کرد، سۆز و خۆشەویستییمان بووە چەن دڵۆپیّ لە فرمێسك و ماڵاوایییمان لە یەکدی کرد. ئەو شەوە چەن خێزانیّ دیکە، لەگەڵ ماڵی (نازەنین ) ڕەویان کرد، خۆزگەم دەخواست وەك ئەوان بڕۆیشتینایەو ڕەومان بکردایە، بەڵام ڕێباز ڕازی نەدەبوو.

نزیکی بەرەبەیان بوو، لە دەنگی هیلیکۆپتەر بە ئاگاهاتین، خەڵکی مقۆمقۆیان بوو، لە سەربانەکانەوە سەیری دووریان دەکرد، پاش ماوەیەکی کەم ، سوپاییّ بیّ شومار بە چوار دەوری گوندەکەمان دابەشبوون ، زۆر ترساین، تەنیا هیوامان خۆشاردنەوە بوو لەو حەشارگانەی بۆ ڕۆژیّ وا ڕەش، دروسمانکردبوو.

( ڕێباز )ی برام لە حەشارگەی پشت گەوڕەکەوە خۆی شاردەوە, (نەریمان ) ی دەسگیرانم لە حەشارگەیتەنیشت گەوڕەکەوە، منیش لە ژووری کادینەکە بووم، بەرانبەر ئەو دوو ژوورە بوو کە باوکم و دایکمی لێبوون ، دایك و باوکم خۆیان نەشاردەوە و هەر لە ژوورەکەیان مانەوە، باوکم گوتی: ئێمە پیر

بووینە نامانگرن، بەڵام کچەکەم ئابروو گرانە، زۆر ئاگاداری خۆت بە، ئەمانە بیّ ئابڕوون.

گوتم: باوکەگیان، لە ناوەڕاستی کای نێو کادینەکە، شوێنێ قوڵم دروسـکردووە ، هـەر کـە هـاتن بـەرەو کادینەکـە، خـۆم فڕێدەدەمـە نێویەوە و کایەکە بە سەر خۆمدا دەکەم ، با بخنکێم، نەك دەسـی ئەم بێ ئابڕوانە بکەوم. باوکم چاوەکانی پڕ فرمێسك بوون ، سەری ماچ کردم و گوتی: خوا بتپارێزێ کچەکەم، خوا بتپارێزێ.

نەمدەزانی دڵم بۆ کێ پەرێشانە،( باوك , دایك , برا, دەسگیران ) هەر یەکەو خۆشەویستییەکی تایبەت و زۆر پیرۆزیان هەبوو،زۆر لە دڵمدا شیرین بوون.

بـە بڵنـدگۆ بـانگی خـەڵکی ئاواییـان دەکـرد، هاوزمـانی خۆمـان هـاواری دەکـرد و سـوێندی بـە شـەرەف دەخـوارد، خۆمـان بدەینـە دەسەوە هیچمان لێ ناکەن. زانیان سوودی نییە، چەن هاوەنێکیـان خستە گوندەکەمانەوە، هەر بێ سوودبوو، هیچ کەس نەدەچوو.

کەوتنــە پــشکنینی ئاواییەکــەمان، هــەر کەســێکیان دەســگیر بکردایە، ئازاریـان دەدا و زوڵمیـان لێدەکرد، هاواری ژن و منداڵ و کچان، دڵـی داچڵەکانم , هەناسـەم تـەنگ ببـوو، دەترسـام , خـەیاڵ بردبومیـەوە کـە نـۆرەم دێـت و دەکەومـە بەردەسـیان, دەبـێ چـییم لێبکەن !! حەزم دەکرد دەربچم ،خۆم بگەیەنمە دایك و باوکم، بەڵام بـیری قـسەکانی بـاوکم دەکـردەوە کـە خـۆم زۆر بپـارێزم، چـونکە ناموس گرانە، پەشیمان دەبوومەوە.لـە درزی دەرگـای کادینەکـەوە سەیری نێو حەوشەم دەکرد, سەیری ڕەنگ زەردیـی و ترسـی دایك

و باوکم دەکرد,تەماشای دەسەکانیانم دەکرد ، بەرزیان کردبوەوە ڕوو لە ئاسمان و لە خوا دەپاڕانەوە تا بمانپارێزێ.

چوونە ماڵی هاوسێکەمانەوە، هەستم لای دەنگی ڕاکێشانی چەکەکانیان، دەنگی پێیەکانیان بوو.

(خاوەر ) خان هاواری لێ بڵندبوو، دەپاڕایەوە کە واز لە کوڕەکەی بێنن و لێی نەدەن، گوێم لە هاواری ( نەرمین ) ی دەسەخوشکم بوو، ئازاریان دەدا.لە ناکاو بە لەقە و قۆناغە تفەنگ، دەرگای حەوشەیان کردینەوەو هاتنە ژوورەوە، بە پەلە خۆم گەیاندە نزیك حەشارگەکەم تابیکەمە گۆڕم. گوێم لە هاواری دایکم بوو دەیگوت: بۆ لەو پیاوە پیرە دەدەن، وازی لێبێنن نەخۆشە. جاشێ هاواری لە دایکم کرد و گوتی: منداڵەکانتان لە کوێیە ؟!!

دایکم گوتی: تۆ هاوزمانی خۆمانی ، لە بری پارێزگارییمان لێبکەی، لەوان خراپترمان لەگەڵدا دەکەی!!خۆم گەیاندەوە دەرگای کادینەکە و لە درزی دەرگاکەوە سەیری حەوشەکەم دەکرد، باوکم بینی لێیان دابوو، زۆر بە کەساسی لە بەردەم دڕندەکان وەستابوو، ئاگری سۆز و بەزەیی سوتانمی، دەمویست چاوم بشارمەوە و ئەو دیمەنە نەبینم، لەگەڵ ئەو هەموو کەساسیەیدا، چاوی هەر لای کادینەکە بوو.( جاشەکە ) گوتی: چۆن ئەم هەموو مەڕەتان هەیەو کوڕتان نییە، ،ئێوە درۆدەکەن، باوك و دایکم بێدەنگ وەستابوون و هیچیان نەدەگوت، ئەوانیش چوون بۆلای گەوڕی مەڕەکان، لەوێدا

(نەریمان) ئاشکرابوو، بە چوار کەسەوە، بە شەق و قۆناغە تفەنگ، کەوتنە لێدانی, دایکم چوو دەسیان بگرێ، عارەبێکی ڕەشی پیس، پالێکی بە دایکمەوە نا و خستییە سەر زەوییەکە. ( نەریمان ) هاواری بوو بە دەسیانەوە, باوکم هاواری کرد و گوتی: بۆ وامان لێدەکەن، خوا لێتان هەڵناگرێ.یەکیان گوتی: گەر خوا هەڵیناگرێ، بۆ نایەتە وەلام و تۆڵەتان بکاتەوە، قۆناغێ تفەنگی دایە سەر سینگی باوکم و گوتی: دەخوا بابێتە وەلام. باوکم هاواری کردو بە ئازارێکی زۆرەوە کەوتە سەر زەوی، لەو کاتەدا ویستم دەربچم و تۆڵەی باوکم بکەمەوە، بەلام لەبەر باوکم نەمدەوێرا، کە بمبینێ بە دەسی ئەم بێ ئابڕوانەوەم، یەکجاری ئازارەکانی زیاد دەکا تەنیا دەسەلاتی قژ ڕنین و گریانێکی بێدەنگبووم،پتریش خۆم دەرنییەوە کاتێ هەرسێکیان درانە پێش بەرەو دەرەوەی حەوش. حەوشەکەمان کشومات، تەنیا دەنگی باعەی مەڕەکان دەهات، ئەوانیش بۆ (نەریمان)ی هاوڕێیان دەگریان. ترسم لێنیشت ئاخۆ دەبێ کەسی دیکە نەیەت و ئاشکرابم، خۆ ئێستە هیچ کەس لە حەوشە نیە جگە لە من و (ڕێباز ) ی برام. ویستم بە ڕاکردن بۆلای بچم، بەلام ڕاڕایی گرتمی، دەترسام بچمە دەرەوە لە نزیک حەشارگەی براکەم ئاشکرابم و ئەو برا تاقانەیەم بگرن, پەشیمان بوومەوە، بڕیارمدا، هەرکەسێ ڕوو لە کادینەکە هات، بە پەلە خۆم بگەیەنمە حەشارگەکەم و دوا مالاوایی لە ژیان بکەم و بچمە ئەو

گـۆڕەی ئامـادەم کـردووە.لـە درزی دەرگاکـەوە سـەیری دیمـەنی حەوشەم دەکرد و دەگریام، لە پڕ جاشێك , "باڵاکورتێکی لاواز ، ڕەش پێـست، دەموچـاو ئـاوڵاویی"، هاتـە حەوشـەوە و بـانگی دەکرد، کێ لە ماڵە با خۆی بداتە دەسەوە، چونکە پاش کەمێکی دی گوندەکە تالان دەکرێ و پاشان دەسوتێنرێ و دەڕووخێنرێ!!

وەك ئەوەی لە مـاڵی خۆیدا بسوڕێتەوە، پیاسەی نێو حەوشەی دەکـرد، ڕووبـەڕووی کادینەکـە هـات، بـە پەلـە خـۆم گەیانـدە حەشـارگەکە و بە کایەکـە خـۆم داپۆشـی ، هەناسـەم تـەنگ ببـوو, دەنگی جیڕەی دەرگاکەم گوێ لێبوو، زۆر ترسام کە تووشی کۆکین بێم و ئاشکرابم، (جاشەکە) چەکەکەی ڕاکێشاو گوتی: کێ لە ژێـر کایەکەدایـە بـا دەرچـێ، گـەر نـا، ئـەوا هـەر ئێـستە کادینەکـە دەسوتێنم, چونکە دڵنیـام یـەکێ لـە ژێرکایەکە خۆی شاردوەتەوە. وامدەزانی یەکێکە و لە نێو بیرەوە قسە دەکا، چونکە کایەکە گوێی کپ کردبووم.دەسێ هاتە نێو کایەکەوە و گرتی بە قژەکەمدا، کەمێ خۆم گرت و هاوارم نەکرد، کە زۆر بە توندیی ڕایکێشام،هاواری لێ بڵنـدکردم، زۆر بـە سەرسـوڕمانەوە تەماشـای دەکـردم، چـاوەکانی تەواو کردبوونەوە، دەیگوت: گوناھ نییە شۆخێکی وەك تۆ، لە ژێـر ئەم کایە تۆزاویەدا خۆی بخنکێنی!! قوربانی تۆزی کایەکە بم، گەر بەو تۆزە نەبووایە نەمدەدۆزیتـەوە و لـە بینینـی ئـەو چاوە جوانانـە بێبـەش دەبووم، بـەڵام وا دیارە خـوا ماچێکی ئـەو ڕوومەتـە ئاڵ و

ئەو گەردنە سپییەی، بە قسمەتی من کردووە بۆیە ئاشکرای کردی.من حەپەسابووم، نەمدەزانی خەونە یا ڕاستەقینەیە!!

گوتی: گیانەکەم، گەر ماچێکم بدەییّ، ئەوا لەم سوپایە ڕزگارت دەکەم و تا سوپاکە دەڕوا پێکەوە لەم شوێنە دەمێنینەوە،بە هۆشی خۆم هاتمەوە گوتم: بێئابڕووانە, خۆفرۆشانە، کەوتوونەتە پێش سوپای بێگانەوە و کون و کەلەبەری گوندەکانیان پێدەناسێنن. دووبارە بە پێکەنینێکی گاڵتەجارییەوە گوتی: گەر ڕازی بی، بە ئارەزووی دڵی هەردووکمان لەم کادینەیە ڕادەبووێرین. تفێکم لە نێوچەوانی کرد و گوتم: ئەی بێئابڕوو، دەتەویّ ئابڕووم بەری. تفەکەی لە نێوچەوانی سڕییەوە، تفەنگەکەی لە خوار کایەکەوە دانا،پەلاماریدام، بەلاّم چونکە لە خۆم زۆر بالاّی کورتتر و لاوازتربوو، قینیّ زۆریش لە دڵمدا پەنگی خواردبووەوە، زۆر هەوڵیدا ،بەلاّم نەیتوانی بە سەرمدا زاڵبیّ، هەناسە بڕکێی بوو، کەوتە قسەیخۆش و گوتی: کچی باش، گەر خۆت بدەیە دەسم، ناتدەمە دەسی سوپاکە. ئەمجارەیان زللەیەکم پێیدا کێشا، ئەویش دەسی لە قژەکەم گیرکرد، تا خوارەوەی کایەکە نەوەستاین. هاوارم کرد. گوتی: هاوار مەکە ئاشکرادەبین.

گوتم:سەگباب، قژەکەم بەردە. پتر دەسی توندکرد ، بە سەر زەویەکەیدام و کەوتە سەرم، وازی لە قژەکەم هێنا، ویستی کاری خراپم لەگەڵ بکا.تفەنگەکەی لە نزیکمەوە بوو، ویستم دەسم

بیگاتیْ و هەردووکمانی پیْ بکوژم. پاڵێکم بە سینگییەوە نا، خۆم لە ژێری ڕزگارکرد، دەسم برد بۆ تفەنگەکە، بەڵام نەیهێشت دەسم بیگاتیْ و خۆی گەیاندیْ، منیش پاڵێکی زۆر بە هێزم پێوەنا و بە دیوارەکەمادا، ڕەنگی زەردبوو، هەناسەی پتر تەنگبوو، تەواو بیْ هێزبوو،دیسانەوە پەلاماری تفەنگەکەمدا،بەڵام قژی گرتم و دەرگای کادینەکەی کردەوە وهەر بە ڕاکێشان گەیاندیمیە ناوەڕاست حەوشە،هاوارم کردەوە،گوتم: بێئابڕوو، قژم بەردە. دەسی شلکرد،گوتی: گەر ئێستەش بە ڕابواردن ڕازی بی، دەتگەڕێنمەوە نێو کادینەکە و ناتدەمە دەسی سوپاکە. کە دەسی لە نێو قژەکەم لابرد، تفێکی دیکەم لێکرد، گوتم: ئەی ناپیاوی بێئابڕوو، لە خەڵکی گوندەکەم زیاتر نییم.چەن چەکدارێکی جاش و سەرباز هاتن،بە جاشەکەیان گوت: ئەوە چییە، بۆ وا شێواوی، بۆ جلەکانتان هەموو بە (کا) وەیە، بە پێکەنینەوە گوتیان: خۆ کاری خراپتان نەکردووە؟!! گوتم: بێئابڕووانە،چەکدارە عارەبەکان لە ئێوە شەریف ترن.گوتی:قسەی زل مەکە، با نەتبەینە نێو کادینەکەوە.ئیدی بە ناچاری بێدەنگبووم،گوتم: بێئابڕوون، هەموو شتیان لە دەس دیْ.

عارەبیْ لێپرسراویان بوو، چەکدارێکی عارەبی لەگەڵ جاشەکە جێهێشت و گوتی: بیگەیەننە خەڵکی ئاوایی. ئەوانیش بە پەلە منیان گەیاندە خەڵکی ئاوایی کە لە سەرووی گوندەکەمانەوە

کۆکرابوونەوە. هەموو لە دوورەوە سەیریان دەکردین، کە من و جاشەکە جلەکانمان بە (کا)وە بوو، سەریانسوڕمابوو. لێپرسراوی سوپاکە لەگەڵ لێپرسراوی جاشەکان پێکەوە وەستابوون و قسەیان دەکرد، عارەبەکە چووە پێشەوە بۆ لای لێپرسراوی سوپاکە "دڕندەیەکی چوار شانە، بالأبەرزی کەتەبوو"، سلأوی بۆ کرد و گوتی: ئەم کچەمان لە نێو کادین دەرهێناوە. ئەویش گوتی: ئافەرین، بە پاسەوانە تایبەتەکەی گوت: ناوی بکەرە لیستی پاڵەوانەکان تا( دیاری پاڵەوانی ئەنفال ) ی پێبەخشرێ.

جاشەکە گوتی: گەورەم ئەی من؟

گوتی: یەك کەستان دەنوسین، تۆ بۆ جارێکی دیکە، ویستی قسە بکا، بەلأم لێپرسراوەکە ڕێی پێنەدا، بە دەنگێکی توڕەبوون و گڕەوە گوتی: بۆ وەستاون، بیگەیەننە لای خەڵکی ئاوایی تاوانبار. لێپرسراوی جاشەکان گوتی: ڕاستدەکا بۆ وەستاون، بە مل شۆڕی کەوتە پێش و منیش بە دوایدا، عارەبەکەیش بە دوای مندا.

گوتم: چییت پێبڕا، تەنانەت ئافەرینەکەش بۆ عارەبەکە بوو. گوتی: قسە مەکە، با بە قۆناغە تفەنگ گیانت نەشکێنم.

گوتم: بۆ گیانی خۆمان ئازان.

چوومە نێو خەڵکی ئاواییەوە، باوکم ڕەنگی زەرد ببوو، بە دەنگێکی نائومێدیی، قوڕگێ پڕ لە گریان، چاوی پڕ لە فرمێسك گوتی: کچەکەم، تۆیانش گرت ؟! باوەشم لە باوکمدا و بە سەر

سینگییەوە هێندێ گریام. دایکم گوتی: کچەکەم مەگری، هەموو خەڵکی ئاوایی پێکەوەین، بەڵام دڵم لای ( ڕێباز ) ی براتە، خۆ ئاشکرا نەبووە؟! باوکم سەری لە سەر سینگی لادام، چاوی لە دایکم زەقکردەوە تا بێدەنگبێ، بە منی گوت: کچەکەم بۆ ئەوەندە (کا) بە جلەکانتەوەیە؟!!ئیشاوێکی گریان قوڕگی گرتم، لەگەڵ پرمەی گریانە پەنگ خواردووەکەم، دەنگم بەرزبووەوە، گوتم: باوکەگیان، ئەو ڕیشدارە پیسەت بینیووە، کە گیانی بە (کا) ی کادینەکەمانەوەیە، ویستی ئابڕووم بەرێت.( نەریمان ) چاوەکانی زیتبوونەوە،دەیویست پەلاماری (جاشەکە) بدا،باوکم بە (نەریمان ) ی گوت: کوڕەکەم هیچمان بۆ ناکرێ و دیلین، "ڕۆژان ڕۆژی لە دوایە"، تۆڵەی خۆمان هەر دەکەینەوە، بەڵام باش سەیریکە با بیناسین. بە قینەوە تەماشای کردو هەناسەیەکی هەڵکێشا،ئیدی هەموو بێدەنگ بووین.بێهیواییم لە چاوەکانی ( نەریمان ) دەبینی، ئازاریان زۆر دابوو، زۆر حەزم دەکرد باوەشێکی لێبدەم و لە ئازارەکانمان کەمکەمەوە.لێپرسراوەکان پێدەکەنین، تامەزرۆی تاڵانکردنی گوندەکەمان بوون.

هیچ کەسی دی ئاشکرا نەبوو،یەکێ لەوانە (ڕێبان)ی برام بوو.

لەگەڵ بەرزبوونەوەی ئاگر لە چەن شوێنێکی گوندەکەمان، هاواری ژن و منداڵ بەرزبووەوە، خەڵکی کەوتنە پاڕانەوە لە لێپرسراوەکان، ئەوانیش فەرمانیان بە چەکدارە دڕندەکانیاندا،

بێدەنگمان بکەن. بە شەق و قۆناغە تفەنگ کەوتنە ئازاردانمان، دەسیان نەدەپاراست لە ( ژن ، منداڵ ، پیر ، پەککەوتە و گەنج ) هەموو بە یەك چاو سەیردەکراین، خۆمان بە سەر یەکدیادا، هاوارمان دڵودەروونی مرۆڤی دەهەژان، بەڵام ئەمانە دڕندەی دوو پێ بوون و بێبەری بوون لە مرۆڤ و مرۆڤایەتیی.پاشان هەر بە قۆناغە تفەنگ کردیانینە نێو ئیڤاکانەوە بەرەو بەندیخانەکانی نێوشار. هێندێکیشیان مانەوە لەگەڵ لێپرسراوەکان بۆ تاڵانکردنی گوندەکەمان.

( ٣ )

دوو سەربازی عارەب لەگەڵ ئەو جاشەی منی گرتبوو، لە دواوەی ئیڤاکە بە سەرمانەوە وەستابوون، ئێمەش دانیشتبووین، بۆمان نەبوو هەستینە سەر پێ، هەموو بێدەنگ ببووین، تەنانەت منداڵەکانیش لە ترسان تاسابوون و نەیاندەوێرا قسەبکەن یا بگرین.دوورکەوتینەوە لە گوند، ماڵاواییمان کرد لە کانی بەرماڵان، لە گوڵە نێرگز و گوڵاڵە سوورەی قەدپاڵی چیاکان، کە ئەم بەهارەیان لێتاڵبوو، چونکە لە چاوەڕوانیی بوون تا ببنە چەپك و بکرێنە دیاری بۆ خۆشەویستان،بۆنیان تێکەڵ بە هەناسە و خوێنی گەشی عاشقان بێ.

سەیری (جاش)ەکەم کرد، دیمەنە قێزەونەکەی هاتەوە یادم، ئەویش تەماشایەکی کردم و دەسی بە شواربە پیسەکەیدا هێنا، پاشان جلەکانی دەتەکان بۆ لابردنی ئەو(کا)یەی کە هێشتا بە سەر جلەکانییەوە مابوو، بزەیەکی زۆر ناشیرینی کرد و چاوێکی لێداگرتم، ئارامیم نەما، هەستام پەلاماری بدەم و پاڵێکی پێوەنێم وفڕێیدەمە نێو شیو و دۆڵەکانەوە،بەڵام باوکم و (نەریمان)

نەیانهێشت.(جاش)ەکە گوتی: تۆ دەتەوێ پەلاماری من بدەی؟! ئێستە لێرەوە فڕێتدەمە خوارەوە؟!!

(نەریمان) گوتی: مەگەر بە سەر لاشەکەی مندا بڕۆی و فڕێی بدەیە خوارەوە، ئەی بێئابڕوو.

باوکم گوتی: توخوا ئێوە شەرمتان بە خۆتانە، کەوتوونەتە پێش ئەم قولەڕەشانەوە و نامووسەکانمان دەدەنە دەسیان بۆ ئافەرینێ، کچەکەم بە خۆڕایی پەلامارت نادا گەر بەرانبەری ناپاکیت نەکردبێ،دڵنیابە ئەم تۆڵەیەت لێدەکەینەوە،بۆ کوێ دەچی!!

ڕەنگی جاشەکە زەرد ببوو، بە تووڕەییەوە کەوتە جنێودان و دەیگوت: ئێوە شایەنی لەمەش خراپترن.

(نەریمان)گوتی: بە زمانەکەمان قسە مەکە، ووشەکانمان پیس مەکە، چونکە زۆر گوناهە تۆ هاوزمانمانی، بڕۆ، بڕۆ بە زمانی قولەڕەشەکان قسە بکە.

جاشەکە گوتی: قسەی زیاد مەکە، بانەیەم بە قۆناغە تفەنگ مێشکت بتەقێنم.

باوکم گوتی: بۆ ئازاردانی خۆمان پاڵەوانن.

عارەبەکە خۆی تووڕەکرد، گوتی: بێدەنگ بن.

جاشەکە گوتی:ئەمانە تەنیا بە قۆناغە تفەنگ وشەق بێدەنگ دەبن.

دایکم و خەڵکەکە گوتیان: بەسیەتی واز بێنن.

هەموو بێدەنگ بووین، چاوەڕوانیی چارەنووسێکی ڕەشی نادیار بووین.

لەگەڵ هەر تاسەیێ هەناومان دەهاتە خوارەوە، دەپاڕامەوە لە خودا لەگەڵ تاسەیێ لەو تاسانە، جاشەکە بکەوێتە خوارەوە و ملی بشکێ و دڵمان هێور بێتەوە. پاش ماوەیێ لە نێو تاسە و بڕینی چەمی گوندەکان، گەیشتینە سەر شەقام، تاسە نەما، ئیڤاکە بە ئارامی دەڕۆیشت.سەیرێکی (نەریمان)م کرد،لە دڵی خۆمدا گوتم:دەبێ بگەڕێینەوە گوندەکەمان و زەماوەند سازکەین!!

هەر خۆم دەمگوت: ئێمە یەکجار زۆرین، لە پیر ، پەککەوتە ، ژن و منداڵ، بڕوا ناکەم هیچمان لێبکەن، لەوانەیە ئامۆژگاریێ بێ، تا لەمەولا هاوکاری پێشمەرگە نەکەین.

گەیشتینە شار، چاومان دەگێڕا، ئاخۆ ناسیاوێ نابینین، هەموو سەرەتاتکێمان بوو بۆ بینینی خەڵکی، بۆ ناسینی ناسیاوەکانی شارمان، بەڵام جاشەکە و سەربازەکان تووڕەدەبوون و دەیاندایە سەر هەرکەسێ ملەقوتێی بکردایە.لە شار دوورکەوتینەوە تا گەیشتینە مەرکەزێکی سەربازی رژێم.

(٤)

نزیکی ئێوارە بوو، گەیشتینە ئەو مەرکەزەی کە لە چوار لاوە بە سیم تەنرابوو، پانتاییەکی زۆری هەبوو، خەڵکی گوندەکان بە پیر ، ژن ، منداڵ ، کوڕان و کچانی گەنج، لەو چۆڵییە ،بێ نان و ئاو بەندکرابوون، پاسەوانی تایبەت لە کڵاو سوورەکانی رژێم چاودێرییان دەکرد، لەبەر برسێتیی و تینوویێتیی و ترسی جەللادەکان، ڕەنگی ئاڵ و سوور و جوانیان، بە ڕەنگی زەرد و وشك گۆڕیبووەوە، ئێمەش بووینە یەکێ لەو بەندکراوانە.

خەڵکی بێزار و بێهێز ببوون، شەو و رۆژ گوێڕایەڵ بوون بۆ هەواڵ، هەواڵێ خۆش، پروپاگەندەی ڕۆژانە وەك ڕۆژنامەیێ وابوو.

"یەکێ دەیگوت: دەڵێن ئازادمان دەکەن لەبەر ژن و منداڵ"، "یەکێکی دی دەیگوت: دەمانکەنە ئاوی رووبارەکانەوە"، "ئەوی دیکەیان دەیگوت: دەمانکەنە ژێر لمی بیابانەوە"

چەندین پروپاگەندەی ناخۆش لە لایەن دارودەسەکانی ڕژێمەوە دەبیسران، وەك جەنگێ دەروونی بەکاریان دەهێنا بۆ ئاڵۆزبوونی باری دەروونی ئەنفالکراوان.

هەر لەو ڕۆژەوەی گوندیان سوتاندین، دایکم هەمیشە بێ هۆشبوو، بەو ڕۆژگارە لەگەڵ دایکم دەگریاین بۆ (ڕێبان) ی برام، ئاخۆ دەبێ ڕزگاربووبێ و نەبووبێ بە سووتەمەنیی بۆ سووتاندنی گوندەکەمان. زۆرجار لە نیوەشەودا، باوکم دەبینی بە کورکەکورك، بە نهێنی دەگریا، کاری لێدەکردم وگریانم بۆ گریانەکەی باوکم دەهات، چونکە باوکم نەبینیبوو لە ژیانیدا بگری.!!

(نەریمان) ڕیشی هاتبوو، ڕەنگی زەرد ببوو، تەواو شێوابوو، کە تەماشام دەکرد، زەردەخەنەیێ بە درۆی بۆ دەکردم, بەڵام دەمزانی لە ناخەوە بە تەواوی ڕووخاوە و بێهیوا بووە.شوێنەکە زۆر قێزەونبوو، چەندین جۆر نەخۆشی بڵاوببووەوە، خەڵکی بێ هێزببوون ولێیان دەمرد.

ئێوارەیێ بوو، پاسێکی زۆر هات بۆ مەرکەزەکە، هێزێکی کڵاو سووری زۆریان لەگەڵدا بوو، نەك تەنیا لە ئێمەی بەندکراو، تەنانەت لە پاسەوانەکانی ئەو مەرکەزەش خۆیان توورەدەکرد. هەر لای دەرگای سیمەکەوە، دەسیان کرد بە سەرخستنمان بۆ نێو پاسەکان، زۆر بە پەلە سەریان دەخستین، گەر یەکێ خاو بڕۆیشتایە، چەن کێبڵێکیان لە پشتی قایمدەکرد و هاواریان لێبڵندەکرد، چاوپۆشییان لە هیچ کەس نەدەکرد، بە ماوەیەکی زۆر کەم هەمووانیان سواری پاسەکان کرد.

نێو پاسەکان زۆر خۆشبوو، پەردە لە سەر جامەکان بوو، قەدەغە بوو یەکێ پەردەکان هەڵداتەوە و سەیری دەرەوە بکا، هیچ کەس نەیدەتوانی لەگەڵ هاورێکەی تەنیشتی قسەبکا، تەنانەت گریانی منداڵەکانیش قەدەغە کرابوو. زۆر ڕۆیشتین، نەماندەزانی بۆ کوێ دەچین، هەموو لە سەر کورسییەکان گۆج ببووین.

لە شوێنێکدا وەستاین، پاسەوانەکان بە پەلە دابەزین و بە شۆفێرەکەیان گوت: دەرگاکە دابخە. بە هەلمان زانی، سووچێکی پەردەکەمان لابرد و تەماشای دەرەوەمان دەکرد.لە سەر پردێ بووین، رووبارێ پانوبەرین بە ژێرماندا دەڕۆیشت، زۆر دەترساین ئێستە یەکە بە یەکەمان فڕێدەنە نێو ئەو رووبارەوە و هەر لێرە کۆتایی بە ژیانمان بێنن.

یەکێ گوتی: پروپاگەندەکان ڕاستبوو کە دەمانکەنە رووبارەوە و دەبین بە خۆراکی ماسییەکان. لە خەیاڵی ئەوەدا بووم چۆن دەکرێینە نێو رووبارەکەوە و دەخنکێین!! "خۆم دەهاتە پێش چاو چۆن خنکاوم و ماسییەکان لە سەر لاشەکەم کۆبوونەتەوە و بوومەتە خۆراکی ئەو ژەمەیان". لە پاڕانەوەی خەڵکی بە ئاگا هاتم، دەیانگوت: خوایە گیان فریامانکەوە، خوایە گیان گەر دەمانکوژی بە خنکاندنی نێو ئاو نەمانکوژی. ئەبڵەق ببووین، چاوەکان بە قووڵدا چووبوون، لە چاوەڕوانیی دوا ساتەکانی مەرگ بووین، ووشکبوونی لێوەکان و زەردبوونی ڕەنگ و ڕوخسارەکان، مایەی

ئەو فیلمە ترسناکە راستەقینەیەبوو، لە نزیك ڕووداندا بوو. لە پڕکڵاو سوورەکان سەرکەوتن و بە شۆفێرەکەیان گوت: دەرگاکە دابخەو بکەوە دوای قافڵەکە. بڕوامان نەبوو لە خنکانی نێو ئەو رووبارە رزگاربووبین، بەڵام کە زۆر دوورکەوتینەوە، ئینجا هۆشمان هاتەوە.

پاش چەن کاژێری، بە ڕووناکی عەمودی سەر شەقامەکان کە جاروبار نێو پاسەکەی ڕووناك دەکردەوە، زانیمان لە نێو شارێکداین، بەڵام نەماندەزانی چ شارێکە، پاش ماوەیی، دیسانەوە تاریکی دەسی پێکرد و ئەو شارەمان جێهێشت.

زۆر ڕۆیشتین، لە سەر شەقام لایدا و چووینە سەر ڕێگەیی تاسەی زۆربوو، دڵم بە تاسەکان زۆر خۆشبوو، گوتم: لەوانەیە بەرەو گوندەکان بمانگەڕێننەوە.

دیسان لە شوێنی وەستا، کڵاو سوورەکان دابەزین، لە سوچی پەردەکانەوە سەیرمان کرد، دەشتایی پانوبەرین بوو، یەکی گوتی: ئەمە ئەو بیابانەیە کە باسیان دەکرد، ئەمجارەیان ڕزگار نابین!! خۆزگە هەر فڕی دەدراینە ڕووبارەکەوە، خۆ پێش مردنمان تێر ئاومان دەخواردەوە.

کڵاو سوورەکان گوتیان: وەرنە خوارەوە.

ترساین، ترسێکی زۆر سامناك رووی تێکردین، ترس و دانیشتنی نێو پاسەکە گۆجی کردبووین، گریان و هاوارمان لەو

بیابانە دەنگیدەدایەوە،ئەوانیش بە لێدان و جنێودان هەمووانیان بێدەنگدەکرد. یەکەمجار بوو لمی بیابان ببینم، زۆر دەترسام بەو لمە دەم و گوێ و چاوەکانم سواخ بدرێ، تەماشای ئاسمانم کرد، گریانم بۆ ئەستێرەکان دەهات، هەموویانم دەناسییەوە، هاوڕێی ڕاستەقینەم بوون، شەوانە دەبوونە میوانی ئاسمانی گوندەکەمان، یادگارییەکانی دەهێنایەوە بیرم.

پاش نیو کاژێرێ، لەگەڵ سەرمای ووشکی بیابان و چاوەڕوانیی مەرگێ کە ئاشنامان دەکا لەگەڵ ژێر لمی بیابان، بە (ئامێری بێتەل)ی دەسیان، قسەیان لەگەڵ سەرووی خۆیان دەکرد و چاوەڕوانیی فەرمانیان بوون، لە پڕدا و لە ماوەی دە خولەك، چووینەوە نێو پاسەکان و کەوتینەوە بڕینی ڕێیەکی چۆڵ و نادیار ئاخۆ لە چ شوێنێکی ئەم بیابانە بە دەمی شۆفەڵەکانیان چاڵیان بۆ هەڵکەندووین و بە کۆمەڵ دەماننێژن. لە شوێنێکی دیکەدا وەستاین،لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەمە سێیەم وەستان ودوا وەستانە.ئەوان دابەزین، کە لە پەردەکەوە سەیری دەرەوەم کرد، ڕوناکی گڵۆپم بینی، بەڵام نەماندەزانی کوێیە. لە باری دەروونییەکی زۆر ئاڵۆزدا بووین، شەڕێکی دەروونیان بەرانبەر ئەنجامدەداین، پەرۆش و سەرگەردانی کردبووین. هەمووانیان لەوێدا دابەزان، سەرمان سووڕمابوو، لەم بیابانەدا، تەنیا ئەم مەرکەزەی لێیە.

(٥)

نیوەشەو تێپەڕ ببوو، چوار دەوری مەرکەزەکە بە گڵۆپ ڕووناك ببووەوە و وەك ڕۆژی لێهاتبوو، سەگێکی زۆر لەو دەوروبەرەدا هەبوون و دەوەڕین، سەگە بۆرەی خۆمانی دەهێنایەوە یادم.

هەر لە گۆڕەپانی مەرکەزەکە کۆکراینەوە،لە نێوان دایك و باوکم لێی نووستم.بەیانی هەستاین، لە مەرکەزێکی دوو نهۆمی زۆر گەورەدا بووین، چەندین هەزار ئەنفالکراو لەو مەرکەزەدا بەندکرابوون، بەو بەیانی زووە جەللادەکان کۆببوونەوە تا لە یەکدی جیامان بکەنەوە، (کچان، کوڕان،، منداڵ، باوك، دایك) هەریەکە بۆ هۆڵی تایبەتیی خۆی.دەسی باوکم توند گرتبووتا نەهێڵی جیا بکرێمەوە، بە ڕاکیشانیش دەسم لە دەسی باوکم نەدەبوەوە، زۆر دەترسام، دەپاڕامەوە و دەگریام کە وازمان لێبێنن، بەڵام قۆناغە تفەنگێکیان دایە سەر دەسی باوکم، دەسی لە نێو دەسمدا شل بووەوە، ئەمجارەیان (نەریمان) هات نەهێڵێ، پەلاماری چەکدارەکەیدا و گرتی بە چەکەکەیدا لێی بسێنێ، جەللادێکی دی، قۆناغە تفەنگێکی بە سەر (نەریمان)دا و هەر لەوێدا خستی، چەن قۆناغێ دیان بە سەریادا تا خوێنیان بە سەریدا هێنایە خوارەوە،

ویستم خۆم بگەیەنمە (نەریمان)، بەڵام بێسوودبوو، گرتیان بە قژمدا، بە ڕاکێشان بردیانم، دایکیشم هەر هاواری دەکرد و بێهۆش کەوتبوو.خراینە هۆڵی تایبەت بە کچان، ئەو ڕۆژە هەر دەگریام بۆ دەسی باوکم و سەری نەریمان و بێ هۆشی دایکم. جەللادەکان هەر بە زەبری کێبڵ سەمونیان لێ دابەش دەکردین، جاروباریش ئاو، زۆرجار خەڵکی بەری نەدەکەوت، ڕۆژانە چەندین کەس لە برسان دەمردن ، کارەساتی ژانی ژنی دووگیان، لەو شوێنەدا، کارەساتێ دیکەی دڵتەزێن بوو.

ناخۆشترین هەواڵم پێگەیشت، کە (نەریمان)ی دەسگیرانم بە هۆی لێدانی سەریەوە و لە پێناوی مندا گیانی لە دەسداوە، خۆم بۆی دەکوشت، دەمویست بە لێدانی خۆم دوایی بێنم بە ژیانم، لە پاش (نەریمان) ژیانم بۆچییە،بەڵام دەسە خوشکەکانم نەیاندەهێشت، لەگەڵ هەر لە هۆش چوونێکمدا لە سەر ڕانی یەکێکیان هۆشم دەهاتەوە.چوار دەوری مەرکەزەکە کرابووە گۆڕستان، گۆڕستانێکی والا بوو، هەر بە پیاوانی ئەنفالکراو چاڵێکی بچووکیان هەڵدەکەن، کە هەر لاشەکە بشارێتەوە، سەگەکان بە ئاسانی هەڵیاندەدایەوە و دەیانکردە خۆراکی ژەمەکانیان. (نەریمان) زۆر کاری لێکردم، چەن ڕۆژێ بێدەنگی کردبووم، چونکە حەپەسابووم و باوەڕم نەدەکرد.

دەسەکانی نەریمان،ئەو پەنجانەی شمشاڵی پێ لێدەدا، دەهاتە پێش چاوم کە چۆن ئێستە لە نێو دەمی سەگەکاندایە، گوێم زرینگایەوە بەو ئاوازەی لەگەڵ دەنگی بولبوول و قاسپەی کەودا پێشبڕکێی دەکرد، سەرم داخست بەم بیرکردنانەوە، شەو و ڕۆژم بە سەر دەبرد.

(٦)

لە شەوێکی درەنگدا، نیوەشەو تێپەڕ ببوو، ئێمەی کچان هێشتا نەنوستبووین، کۆمەڵ کۆمەڵ دانیشتبووین و گفتوگۆمان دەکرد. چەن جەللادێ چاوچنۆك هاتنە هۆڵەکەمانەوە، هەموو بێ دەنگبووین، سەرمان داخست، دەترساین زوڵممان لێبکەن.یەکیان بە زمانەکەمان کەوتە قسەکردن،بەڵام چونکە زمانەکەمان باش فێر نەببوو درەنگ تێدەگەیشتین.گوتی: ئێوە ئازاد دەکرێن، هەموو شەوێ لەم کاتانە، (پێنج کەستان دەبەین بۆ ناوچەکانی خۆتان) کە گوێمان لە ووشەی ئازادیی بوو، هەموو سەرمان بەرزکردەوە، بە دوو کچی لای دەرگای هۆڵەکەی گوت تا بچنە دەرەوەی هۆڵەکە، هێمای بۆ سێ کەسی دی کرد،هەر بە پەلە هەستان و چوونە دەرەوە.(نارین)ی دەسە خوشکم گوتی: خۆزگەم بەوانە ئازادبوون. زۆر کەس خۆزگەی بۆ دەخواستن، بەڵام من دڵم زۆر دەترسا، لەو باوەڕە نەبووم ئازادبکرێن، ڕووم کردە (نارین) و گوتم: خۆزگە مەخوازە بەوانە، بڕوا مەکە ئازادکرێن، ئەمانە بێ ئابڕوون، گەر ئازاد دەکرێن،بۆ بەم نیوەشەوە؟!! (دڵخۆش)ی دەسەخوشکم گوتی: منیش هەمان بۆچوونی (نەسرین)م هەیە، ئەمانە تەنیا

کــاری خراپیـــان لـــە دەس دێ.ئـــەو شـــەوە نەنووســـتم،هەر لـــە چاوەڕوانییدا بووم, دەترسام ئابڕووی ئەو پێنج کچە بتکێنن، پتر دەترسـام بێنـەوە و چـەن کەسـێ دیکـەمان لێبـەرن، ئـەمجارەیان منیش بەرکەوم.ئەو شەوەم بە ترسەوە گەیاندە بەرەبەیان، لەو کاتە دەنگـی پۆسـتاڵی جـەللادەکان دەهـات، هـەر پێـنج کـچەکەیان هێنایـەوە بـۆ هۆڵەکـە و بـە پەلـە دەرگـای هۆڵەکـەیان داخـستەوە. قــژەکانیان ئــاڵۆز ببوو،چــاوەکانیان لـــە ڕژانـــدنی فرمێـــسکی نائومێدیی،سووربببوون، لـە شوێنەکانی خۆیـان دانیشتن و کەوتنـە گریـــان و هاوار،جاروبـــار ســـەریان دادەخـــست و کارەســـاتە دڵتەزێنەکەیان دەهاتەوە یاد، شێتگیر دەبوون، نارەزاییـان بەرانبـەر (خوا)ش دەردەبڕی، کە بۆ ئەم زاڵمانە ناکا بە بەرد!!.

چـوومە نزیکـی (ئاسـکە)، دەسەخوشـکێکی خۆشەویـستم بـوو، سەیرێکی کردم و باوەشی لێدام، گوتی: ئەمانە گورگی برسین، بێ ئابڕوون، پـتر گوشـیمیە خـۆی و پەنجـەکانی وەك قـولاب لـە پـشتم گیرکردبوو، بە چاوەکانی ئەشك بارانی کـردم و بـە کولْ دەگریـا، بـە دەنگێ بەرز و بـە گریـانێکی پڕ نائومێدییـەوە دەیگوت: ئابڕوویـان تکانـدین!! دەســەکانی لــە پــشتم شــلکردەوە، هــاواری دەکــرد و دەیگوت: نازانم بە چیی و چۆن خۆم بکوژم؟!! دەبێ کەی ئەمانە بەزەییان پێمان بێتەوەو بمانکوژن و ڕزگاربین، بە فێڵی (ئازادبوون) ئێمـەیان فریـودا، بـە پەرۆشـەوە تەماشـای کـردم و گـوتی: تـۆ زۆر جوانیی، ئەمانە بە زۆر دەتبەن، گەر بە قسەم دەکەی، ڕوومەتت بـە

نینۆکەکانت شەقارشەقار دەکەی، خۆت ناشیرین بکە تا نەکەویتە بەردەسیان، چونکە چەن بە هێزبی، بەرەنگارییەکی کەمت بۆ دەکرێ بەرانبەر دڕندێتییان، نەخوازەڵا ئێمەی برسی و تینوو!!.

(ئاسکە) زۆر شتی دیکەی بۆ باسکردم، لە بارەی دڕندایەتیی جەللادەکان کە چۆن پیرۆزی ووشەی (کچ) یان زۆر بە ئاسانی و لە ماوەیەکی کورتدا سڕییەوە. کچانی هۆڵەکە، ژمارەمان چوارسەد کچ دەبووین، ئەو دیمەنە قێزەونە و ترسناکەی جەللادەکان بە سەر ئەو پێنج دەسە خوشکەماندا هێنابوویان، ترسێ تۆقێنەر باڵی کێشایە هۆڵەکەمان، گەر لە سەرەمەرگدا بووینایە، هێندە نەدەترساین، چونکە ئەمیان مردن بوو،بەڵام هاتنی جەللادەکان ئابڕوو تکان بوو.هۆڵەکەمان کشومات، نەماندەزانی چیی بکەین، پشت بە کێ بەستین، کێ پارێزگارییمان بکا، چیی لەو هێزە بکەین کە بەرانبەری بێ تواناین، تەنیا هاوار و پاڕانەوەمان لە خودا بوو، تا بمانپارێزێ لەم زاڵم و بێ ئابڕوانە. شەو هەنگاوەکانی بەرەو تاریك و تاریکتر دەچوو، تا گەیشتە نیوە و پشوویەکیدا وئیدی زوو نەدەڕۆیشت.هەستمان لای بچووکترین دەنگ بوو کە لە هەر لایەکەوە بێ، کە دەنگی پێی جەللادەکان لە ڕێڕەوەکانەوە هاتە گوێمان، لەگەڵ نزیکبوونەوەی هەنگاوەکانیان و دەنگی پۆستاڵی ڕەشیان ، دڵمان دادەخوڕپا، چاوەکان کرابوونەوە، سەیری دەرگای هۆڵەکەمان دەکرد، دەنگەکە کۆتایی هات، لەبەر دەرگای هۆڵەکەمان وەستان، قفڵی دەرگای هۆڵەکەیان کردەوە، قفڵی دڵی کچانی بێ

تــاوان داخــرا ، کــە هاتنــە ژوورەوە هــەموو لــە ترســان ســەرمان داخست، ئەمجارەیان نەیانـدەزانی چ درۆیـێ رێکخـەن، هـیچ کـەس سەری بەرز نەدەکردەوە، لەگەڵ هاواری هەر کچێ کە دەیـانگرت بـە قژەکــەی و بــە ڕاکێــشان دەیانگەیانــدە دەرەوەی هۆڵەکــە، دڵمــان دادەچڵەکیی، هـەموو بیروهۆشمـان لای ئـەو دەسـە چـەپەڵ و ڕەشـە بوو، کـە ئێستەنائێـستە دەگاتـە نێـو قـژەکانمان. سـەرم بـە تـەواوی خستبووە نێو باوەشم و دەمویـست خـۆم بچووك بکەمـەوە، لێـدانی دڵـم بـە تـەواوی لەشـی دەجـووڵانم، نزیـك ڕیـزی ئێمـە کەوتنـەوە و لێیان هەڵدەبژاردین، هەستم لای بوو کە لە پشتمەوە وەستابوو، لـە پڕ، گرتـی بـە قژمـدا، هەناسـەی تـەنگکردم ، لەگەڵیـدا هـاوارم کـرد، دەپاڕامەوە کە وازم لێبێنن، خۆم بە تەواوی نوساند بـە زەویەکـەدا، دەسـەکانم پێـوەی چەسـپ کردبـوو ، بـەڵام سـوودی نـەبوو، بـە دوو کەسەوە تا دەرەوەی هۆڵەکە ڕایانکێشام، دوا کەس بووم و دەرگای هۆڵەکەیان داخست.

بـەو نیوەشــەوە، هــەموو بەنـدکراوانی ئـەو مەرکـەزە گوێیـان لـە هاواری ئێمەی کچان بوو، دڵنیابووم ئـەو شـەوە هـیچ کـەس نـانوێ، چونکە هەموویان دەیانزانی بەو نیوەشەوە بۆ کوێ دەبـرێین. حـەزم دەکرد دایك و باوکم گوێیان لە هاوارەکەم نەبووبێ تا ئازار نەکێشن و بریـنی سۆزداریان پتر ئازاریان نەدا و نەیانسوتینێ.

(٧)

لەگـەڵ ئـەو هـەموو برسـێتیی و تینـووێتیی و بـێ هێزییـەمان، جوانییەکەمان ببووە بەڵا و نەدەشارایەوە، خۆزگەم بە ناشیرینترین کـەس دەخواسـت، خۆزگـە بـە قـسەکەی (ئاسـکە)م دەکـرد و دەموچاوم بە نینۆکەکانم شەقارشەقار دەکرد.

بردیانینـە ژوورێکـەوە "چوارشـانەیەکی باڵابـەرز، ڕەش پێـست" کـراس و بیجامەیـەکی لەبـەردابوو، ڕۆبێکـی لـە سـەر جلەکانیـەوە لەبـەرکردبوو، پـشتێنی ڕۆبەکـەی بەسـتبوو، لـە سـەر قەنەفـەیێ دانیـشتبوو، کـە ئێمـەی بینی زۆر بە سەرسوڕماوییەوە تەماشـای دەکردین، پێکەنینێ دڕندانە و قێزەونی بە سەرماندا باران، هێمـای بۆ کردن،(کە من لای بمێنمەوە و چوارەکەی دی بۆ ئەوان)، هەر لەو ژوورەوە دەرگاییێ هەبوو بۆ ژووریێ دیکە دەچوو، ئەوانیان بـرد بـۆ ئەو ژوورە.

سەرم داخستبوو، فرمێسك بە چاوانما دەهاتـە خـوارەوە، هێـدی هێدی لێم نزیکبووەوە، خۆم وەك نێچیرێکی بریندار دەهاتـە پـێش چاو کە لە چاوەڕوانیی ڕاوکەرەکەیدا بێ، دەسـی گـەیانـە چـەنەگەم، سەرم هەڵبڕی، چاوەکانم دڵۆپ دڵۆپ فرمێسکیان لێدەباری، لە دڵی

خۆمدا گوتم: ئێستە بەزەیی پێم دێتەوە و وازم لێدێنێ، سەیرێکی سەراپای کردم، دەسی بۆ پرووەمەتم هێنا، زۆر پاڕامەوە وازم لێبێنێ و ئابرووم نەتکێنێ، بزەیەکی بۆ کردم، نامەردانە باوەشی لێدام، خۆم ڕاپسکان و بەرەو سوچێکی ژوورەکە ڕامکرد ، پەلاماری دامەوە، ئەمجارەیان زللەیەکم لێدا، شێتگیربوو و زللەیێ بە هێزی پێداکێشام ، ئاگری لە هەردوو چاوم کردەوە، بەرچاوم تاریك بوو و کەوتمە سەر زەوی، ویستی جلەکانم داکەنێ، بە ئاگا هاتم و خۆم لە ژێریدا ڕزگارکرد و ڕامکردە پشت مێزەکەیەوە، تەپڵەکێ شوشەی جگەرە لە سەر مێزەکە بوو، هەڵمگرت و لە سەروچاویم گرت، بەڵام خۆی لادا، ئەمجارەیان چاوەکانی زەق ببوونەوە و لووتی فش ببووەوە، شالاوی بۆ هێنام منیش ویستم خۆم بگەیەنمە تەپڵەکەکە یا سەری بتەقێنم, گەر هەر نەمتوانی، لە سەری خۆمیدەم و خۆمی پێبکوژم، ڕامکرد بەرەو لای تەپڵەکەکە، لە دواوە شەقێکی زۆر بە هێزی لێدام، لە سەر دەم خستمی، توانای لێبڕیم و بێ هۆشیکردم، هاتمەوە هۆشی خۆم جلەکانی لەبەر داکەندبووم، خەریکی پشتێنی ڕۆبەکەی بوو و بە پەلە دەیکردەوە، پەلاماری جلەکانمدا بیکەمەوە بەرم،دوو زللەی لێدامەوە و بە تەواوی بێ توانای کردم، خۆی دایە سەرم، توانای بەرەنگارییم نەمابوو، هەر هاوارم دەکرد، ،دەمقیژان، بەڵام بێ سوودبوو و ئابڕووی تکانم.

وازی لێهێنام ،دەسم بۆ جلەکان برد تا لەبەریان بکەم، جلەکانی لەبەر دەسم هەڵگرت و کردیە دۆلابێکەوە و کلیلیدا، تفێکم لێکرد، گوتم: ئەی بێئابروو.ئەویش بە پێکەنینێ گاڵتەجارییەوە، دەیڕوانییە لەشم، بە دەسی چەپەڵیی، هێمای بۆ کارەساتە دڵتەزێنە پیسەکەی دەکرد، منیش هەر هاوارم بوو و دەگریام و قژم دەرنییەوە. دەمویست تۆڵەی خۆم بکەمەوە، بەلام رووت بووم، نەمدەزانی چیی بکەم.لە سوچێکی ژوورەکە، لەشی خۆم شاردەوە و خۆم بە تەواوی کوریشکە کردبوو. لە ژوورەکەی ئەودیو، گوێم لە هاوار و پاڕانەوەی دەسە خوشکەکانم بوو، یەکجاری ئازارم دەچەشت. خواردنی لە سەلاجەکەی دەرهێنا و مێزەکەی بە خواردن و خواردنەوە رێکخست، بە گاڵتە پێکردنەوە فەرمووی لێدەکردم، منیش تفێکم لێکرد و سەرم خستەوە نێو هەردوو ئەژنۆم. بەزەییم بە خۆمان دەهات و ئەشکم دەباران، ئەویش هێمای هەرەشەی لێدەکردم، کە پاش نان خواردن تۆڵەی تفەکەم لێدەکاتەوە.کۆتایی بە نانخواردن هێنا ، دیسانەوە پەلاماریدامەوە، تا بەرەبەیان،بە لێدانی شەق و زللە،چەن جارێکی دی شالاوی بۆ هێنام.دواجار جلەکانی لە دۆلابەکە دەرهێنا و بۆی هێنامەوە، منیش لەبەرم کرد،یەکسەر دەسم بۆ بینی برد تا بتوانم بیخنکێنم، بەلام پاڵێکی زۆر بە هێزی پێوەنام،خستمیە سەر زەوی.بە خێرایی زەنگێکی لێدا، هەر چوار دەسە خوشکەکانم بە قژی ئالۆز و

فرمێسکی خوێناوییانەوە، لەگەڵ چوار درندەدا هاتنە ژوورەوە، هێمای بۆ کردن، ئەوانیش دەسیان کرد بە لێدانمان، زۆریان لێداین بە تەواوی بێهێزیان کردین. لێپرسراوەکە ڕووی تێکردین گوتی:ها،کوا موخەریب بێ و ڕزگارتان بکا؟!! پاشان بەرەو هۆڵەکە بردیانین، بە قژێکی ئاڵۆز ، ڕوومەتی شەقارشەقار وخوێناوی، لە دەسچوونی کچێتییمان.حەزم دەکرد لەو زیندانە ئازاد نەبم، بە مردوویی لە نێو گوڕەدا ئازادبم، هیوام نەمابوو، تەنانەت نەمدەویست دایك وباوکم بەم داماویەوە ببینم، برین و ئازارەکانیان پتر قووڵکەمەوە.بیرم کردەوە گەر ئێمە بەرەنگارییان نەبینەوە، جگە لەوەی ناوی کچێتیی هەمووان دەسڕنەوە، دەیان جاری دیکە ئەو دیمەنە قێزەونە، دەبینینەوە.هەر بۆیە بە باشم زانی، ئێمەی کچانی ئەم هۆڵە، هێزێ دروسکەین بۆ بەرەنگاریی ئەم جەللادانە تا نەتوانن بە ئارەزووی خۆیان، بە ڕاکیشانی قژەکانمان لە هۆڵەکە دەرمانکەن و ئابڕوومان بەرن، بڕیارمدا بیروبۆچوونەکەم بڵاوکەمەوە و ببمە دامەزرێنەری خەباتێ، بە ناوی "خەباتی هێزیی گیانی تۆڵەی کچان".

(٨)

ئەو ڕۆژە لەگەڵ زۆر کەس قسەم کرد، "کە دەبێ ئێمە چیدی ڕێ بەم جەللادانە نەدەین بە ویستی خۆیان ئابڕوومان بخەنە ژێر دەسیانەوە، دەبێ هێزێ دروسکەین بە ناوی (خەباتی هێزیی گیانی تۆڵەی کچان)، هەر کە هاتنە هۆڵەکەوە پەلاماریان دەدەین، چونکە ئێمە گەلێ زۆرین و توانایان بە سەرماندا نابێ"

لەگەڵ (شیرین) قسەم کرد گوتی:من هێشتا کچم،کێ دەڵێ دێنەوە.

گوتم: دەبێ چاوەڕوانبین تا ئابڕوومان دەتکێ، کچی باش، دڵنیابە ئەوڕۆ لە ئێمە بوو، سبەی لە تۆیە.(خەدیجە) گوتی: ئێمە ئابڕوومان تکا، جا بۆ کێ خۆمان بفەوتێنین.

گوتم: کچێکی زۆرمان ماوە ببرێ،" با خۆپەرست نەبین، با بیسەلمێنین ئابڕوو لای ئێمەی کچانی کورد زۆر گرنگە و لە پێناویدا سڵ لە مردن ناکەینەوە، ئێمەی کچانیش توانای خەباتگێڕیمان هەیە بەرانبەر دوژمنان".هێندێ زۆری پێباشبوو ئەم هێزە بە زووترین کات دابمەزرێ، هەبوو ڕاڕا بوو، هێندێکیش وەك (شیرین و خەدیجە) بیریان دەکردەوە. کە شەو هات، وەك

شەوانی دی لە چاوەڕوانیی بووین، بۆ ڕاکێشانی قژی کچان بە دەسێکی ڕەشیی چەپەڵ.دیسانەوە (پێنج)یان لێهەڵبژاردین و بردیانن.گوێم لە هاواریان نەدەبوو، بەڵام دڵم وەك زەنگێ دایدەچڵەکانم، هێزی گیانیی تۆڵەی پێدەبەخشیم. ئەوانەی بڕیاریاندابوو بەشداربن، پتر سووربوون لە سەر دامەزراندنی هێزەکە، ڕاڕاکان دەیانگوت:با پەلە بکەین لە ئەنجامدانی تۆڵەمان.دڵخۆشبووم کە توانیم کۆمەڵێکی زۆر کۆبکەمەوە بۆ بەشداربوونیان لە خەباتە خنجیلەکەمان، زۆربەمان ئەو شەوە نەنوستین و لە چاوەڕوانیی دەسە خوشکەکانماندا بووین، لە بەرەبەیاندا، پاڵیان پێیانەوە نا بۆ نێو هۆڵەکە و دەرگایان لە سەر داخستین.(دڵخۆش) دەموچاوی خۆی دەڕنییەوە وهاواری دەکرد و جنێوی بە دڕندەکانی شەوەدا و دەیگوت: با بە قسەکەی (نەسرین) بکەین، جارێکی دی هاتن، هەر بە کوشتن بیانکوژین، ئێمە چەن سەد کەسێکین لەم هۆڵە بچووکەدا، دەبا هەر لە هۆڵەکە شەهیدبین،خۆ دەڵێن کچانی کورد لە سەر ئابڕوویان چەن جەللادێکیان کوشت.زۆرم پێخۆشبوو (دڵخۆش) ئەم قسانەی دەکرد و وورەی کچانی پتر بەرزدەکردەوە.هەستامە سەرپێ و گوتم: قسەکانی (دڵخۆش) زۆر ڕاستن، با نەهێڵین ئەم جەللادە پیسانە ئابڕوومان بەرن، با بە سزای خەباتی (هێزیی گیانی تۆڵەی کچان) بگەیەنرێن، کێ ئامادە نییە بەشدار بێ، با لە ئێستەوە

پێمـان بڵـێ؟ هـیچ کـەس وەڵامـی (نـا) ی نـەبوو، لـە نـاخی دڵـەوە سوپاسیانم کرد و دانیشتم. چوار تیپمان دروسکرد، چونکە چوار جەللاد شـەوانە دەهـاتن، هـەر تیپـێ یـەکێ سەرپەرشـتی دەکـرد بـۆ پەلاماردانی جەللادێ.

- تیپی یەکەم خۆم سەرتیپ بووم.
- تیپی دووەم (دڵخۆش).
- تیپی سێیەم (ئاسکە).
- تیپی چوارەم (نەرمین).

بە درێـژایی ئـەو رۆژە وورەی کـچانمان پـتر و پـتر بـەرزدەکردەوە، مەشقمان ئەنجامدەدا چۆن و لە چ کاتێکدا شـالاویان بـۆ بـەرین. بـە پێـچەوانەی ڕۆژانـی دیکـەوە، حـەزمان دەکـرد زوو شـەو بـێ و جـەللادەکان بکەونـە داوی (هێـزی گیـانیی تۆڵـەی کـچان) وە، بـە سزای هێزیی کچانی گەلەکەمانیان بگەیەنین.خۆشیێ ڕووی کردە هۆڵەکـەمان، تـرس مـالاوایی لێکـردین، ڕووەکـان گـەش ببوونـەوە، بـزەش لـە سـەر لێوەکـان بـوو، بـە خۆشـییەوە باوەشمـان بـۆ مـەرگ کردبوەوە دروشمی "(کەم ژیان و کەڵ ژیان")مان بەرزکردەوە

(٩)

نیوە شەو نزیکبووەوە، ئەو کۆمەڵەی زوڵمیان لێکردبووین، لای دەرگــای هۆڵەکــەوە دانیــشتین، بــۆ ئــەوەی جــەللادەکان بــچنە ناوەڕاستی هۆڵەکەوە.لەگەڵ گوێبیــستی دەنگی پێیــەکانیان، گەش دەبووینەوە، بە کردنەوەی قفڵی دەرگای هۆڵەکە, دڵی ئێمەی کچان کرایــەوە، تەماشــای ئێمــەیان کــرد و پێدەکــەنین کــە ئێمــە نابــەن ، چــونکە پیرۆزتــرین ووشــەی (کــچێتییان) لێسەندبووین. گەیــشتنە ناوەڕاستی هۆڵەکە، دەسیان لە قژی (شیرین) گیرکرد، هەر چواریان لــە یــەك کاتــدا پــەلاماردران، ئــەوانیش بــە قۆناغــە تفــەنگ زۆریــان لێدەخستین، پــەلاماری تفەنگەکەیمــدا و لــێم ســەند، کــە ڕامکێــشا فیــشەکی تێــدا نــەبوو، هــەر بــە قۆناغــە تفــەنگ، مێــشکیم تــەقان و کوشــتم،(دڵخــۆش)یــش بــە قۆناغــە تفــەنگ ئــەوی بەردەســی کوشت،بەڵام دوانەکەی دی ڕزگاربوون، بە هاوارکردنەوە بەرەو لای لێپرســراوەکەیان ڕایــانکرد.لــە ناکــاو، (١٥ ــ ٢٠) چــەکدار هاتنــە هۆڵەکەمانەوە ، زۆریان لێداین، گەرچی بەرەنگارییمان کردن،بەڵام لە ئێمە بە هێزتر بوون. زۆربە بێهۆش کەوتین و لــە ئازاردا تلمان دەخوارد.کە بە هۆشی خۆم هاتمەوە،هەستم لە دڵم ڕاگرت،خوێنی

خۆشیی تۆڵەی بە سەر ئەندامانی جەستەم دابەشدەکرد.سەرم هەڵبڕی،لاشەی جەللادەکانیان بردبوو، ئەو چەکەی بە دەسمەوە بوو، بردبوویان و دەرگای هۆڵیان لێداخستبووین.تەماشای (دڵخۆش)م کرد، بە دەسەکانی هێمای بۆ دەکردم تا بۆ لای بچم، منیش بە خشکەخشك خۆم گەیاندێ. زۆر بێهێز ببوو، لەش و سەروچاوی برینداربوو، بە کراسەکەم خوێنی سەروچاویم سڕییەوە، دەسم خستە نێو دەسی، دەسی گوشیم وچەن دڵۆپێ فرمێسك بە ڕوومەتیدا هاتە خوارەوە، بە دەنگێکی نەوی گوتی:(نەسرین) گیان من دەمرم، حەزم دەکرد بەشدار بوومایە لە چالاکییەکی دیکەی خەباتەکەمان، بەڵام چیی بکەم مەرگ میوانمە و کاروانی شەهیدان لە چاوەڕوانییدایە، توخوا ئێوە بەردەوام بن و دروشمی (کەم ژیان و کەڵ ژیان) لە بیر مەکەن. دوا سەرنجیدام و دەسی لە نێو دەسمدا شل بووەوە، مالآوایی لێکردین، گوشیمە خۆم و دام لە کوڵپەی گریان. پازدە کەسمان لێ شەهید بوو، بوونە هۆی ئەوەی پتر وورەمان بەرزبێتەوە، (شیرین) لێم نزیکبووەوە، گوتی: (نەسرین)گیان، من قەرزاری تۆم، گەر تۆ نەبوویتایە، نۆرەم هاتبوو.گوتم: ئێمە هەموو قەرزاری ئەم شەهیدانەین کە لە نێوماندا ڕاکشاون، چەن ساتێ دیکە مالآواییمان لێدەکەن و ئیدی یەکدیی نابینینەوە.پرمە وکڵپەی گریان بۆ شەهیدانی خەباتیی پیرۆزمان، پرسەیەکی بێ وێنە بوو.

لە پاش سێ ڕۆژ ،دەرگایان لێکردینەوە، لەبەر بۆنی لاشەی پیرۆزی شەهیدان و ڕقوکینەی ئێمەی کچانی خەباتگێڕ، دڕندەکانی ڕژێم نەیاندەوێرا بێنە ژوورەوە، چەن پیاوێکیان لە بەندکراوان هێنا، تا لاشەی شەهیدان بۆ گۆڕستانی والاّ بەرن.

یەکیان گوتی: دەستان خۆش، دەزانن ئێوەی کچانی خەباتگێڕ لە ئێمە زۆر ئازاترن.

گوتم: مامەگیان، زۆر زوڵمیان لێکردین، ئابڕوویان بردین. پاسەوانێ لای دەرگای هۆڵەکەوە،چەکی ڕاکێشا وگوتی:بێدەنگبن.

گوتم: مامە گیان لێیان مەترسن، ئەمانە ترسنۆکن، تەنانەت چەکیان فیشەکی تێدا نییە، چونکە لە ڕۆژێکی وەك ئەوڕۆ دەترسان. هاواری بۆ منیش کرد کە قسە نەکەم.

پیاوەکە گوتی: کچەکەم بێدەنگ بە،با ئازارمان نەدەن.

هەرجاری و تەرمی چەن شەهیدێکیان دەبردە دەرەوە، سەری (دڵخۆش)م لە سەر ڕانم دانابوو، کە نۆرەی هات بیبەن، سەرم خستە سەر سینگی و تێر گریام، لە دوا کاروانی بردنی شەهیدان ماڵاواییم لێکرد، گوتم: دڵنیابە پەیام و ڕاسپاردەکەت لە بیر ناکەم.

پاش ماڵاوایی کردنی شەهیدان، هۆڵەکەمان کپ و بێدەنگ بوو، ئەسرینی چاوانیش ووشکبوون، زۆر ماندوو و بێهێز بووین، برسیی و تینوو بووین، ئەو ڕۆژە سەموون و ئاویان بۆ هێنایِن، گەر دوو ڕۆژی دی بخایاندایە، زۆربەمان دەگەیشتینە کاروانی

شەهیدان.شەوێ وەك ئەوەی من خاوەنی پرسەی شەهیدان بم، دەوریان دابووم، منیش گوتم: خۆزگە ئەمشەو دەهاتن ،چەن جەللادێ دیکەیان دەکەوتنە ژێر دەسی ڕقوکینەی ئێمەی کچانی خەباتگێڕ، تۆڵەی خوێنی شەهیدانمان لێدەکردنەوە و بە سزای خەباتی (هێزی گیانیی تۆڵەی کچان) مان دەگەیاندن و خۆمانیش بگەیشتینایە کاروانی نەمران.

پاش نیوەشەو،دوای چاوەڕوانییێ زۆر، کەس نەهات، ئەو مەرکەزە گەورەیە کشومات، تەنیا گوێمان لە دەنگی مرەمرِی سەگەکان بوو،لە سەر لاشەی پیرۆزی شەهیدانی کارەساتی ئەنفال.

(١٠)

بەیانی زوو بوو، چاوەکان بە بەزییەوە دەیانڕوانییە یەکدی و بۆ یەکدی دەدوان کە چ پاڵەوانێتییێ بێ وێنەیان لەو خەباتە پیرۆزەماندا ئەنجامداوە، پشتێکی پۆڵایین بووین لە بۆ یەکدی، سڵمان لە جەللادەکان نەدەکردەوە. لە کاتی خواردن دابەشکردن، وەك جاران نەبوو جەللادەکان بدەنە سەر دەسمان، هەر خۆمان وەرمان دەگرت و لە نێو خۆماندا دابەشمان دەکرد، هیچ کەسمان بێ بەش نەدەکرد، گەر یەکێك ئازاری زۆر بوایە و نەخۆش بووایە، پترمان پێدەدا.ئەو بەیانییە پڕوپاگەندە بڵاوبووەوە، وەك پڕوپاگەندەکانی ڕۆژانی ئاسایی" ئەنفالەکان ئازادەکرێن".هەر ئەو ڕۆژە خواردنی زۆریان بۆ هێنایین.دوان لە بریندارەکان شەهیدبوون، دڵیان تەنگکردم، حەزم نەدەکرد ئازادبم و خەباتەکەمان کۆتایی بێ،چونکە هەر بە کوشتنی دوو جەللادەکە ڕقوکینەمان دانامرکێتەوە ، هەرکەسێ ئەو پڕوپاگەندەیەی باسکردایە، زۆرم پێ ناخۆش دەبوو، تەنانەت توڕە دەبووم.کە پیاوانی بەندکراو بۆ بردنی دوو لاشەی شەهیدەکان هاتن، پرسیارم لێکردن، ڕاستە دەڵێن ئازادەبین؟.

گوتی: بەڵێ کچەکەم، ئینشەڵا ڕاستە، ویستی ڕوونی بکاتەوە، بەڵام جەللادەکان لە دەرگاکەوە لێی تووڕەبوون، ئەوانیش تەرمی هەردوو شەهیدیان گەیاندە کاروانی نەمران.

پاش چەن شەوێ، لە چاوەڕوانیی جەلادەکان بووین تا بێن و لێمان هەڵبژێرن، بەڵام نەدەهاتن، تەنانەت لە کاتی دابەشکردنی خواردن، بە ووریاییەوە دەرگایان لێدەکردینەوە. دڵخۆشبووین کە توانیمان بە سەریاندا زاڵبین، چیدی بیر لە ئابڕووتکانمان نەکەنەوە. دیسانەوە پڕووپاگەندەی ئازادبوونمان بڵاوبووەوە کە لیژنەیێ تایبەت دێ و ئازادمان دەکا.

لە نزیک ئێوارە بوو، لە ڕێڕەوی هۆڵەکانەوە دەنگێکی زۆر دەهات، بە دەنگی پێیەکان، پێدەچوو زۆربن، کە پتر هەستمان ڕاگرت، ڕوو لە هۆڵەکەی ئێمە دەهاتن، لە پێش دەرگای هۆڵەکە وەستان و قفڵی دەرگاکەیان کردەوە. لێپرسراوی مەرکەزەکە، کە هەموو هیوایەکم کوشتنی بوو، لەگەڵ کابرایەکی چوارشانە و کۆمەڵێ پاسەوان هاتبوون. کابرای چوارشانە کەوتە قسەکردن،پێدەچوو پلەی لە هەموویان بەرزتربێ، یەکێك وەرگێڕی بوو، تا قسەکانی بکا بە زمانی کوردیی.

گوتی: ئێمە لیژنەیەکی تایبەتین ، لە پایتەختەوە هاتوین، ئێوە ئازادکەین و بتانگەڕێنینەوە ناوچەکانی خۆتان، هەر ئێستە لیژنەکە (حەفتا) کەستان لێهەڵدەبژێرێ ،ناو و ناونیشانتان

دەنووسن، بە پاسی تایبەت دەتانگەیەنینەوە. ئەم قسانەی كرد و خۆی و لێپرسراوی مەركەزەكە ڕۆیشتن.ڕووەكان گەشببوونەوە لە پێناوی ئازادبوون، هەناسەیەكم هەڵكێشاو سەرم داخست، سەیرم نەدەكرد، تا بانگم نەكەن وئازادبكرێم،پاش هەڵبژاردنی ( ٥٠ ـ ٦٠ ) كەس، بانگیان كردم، بەلاّم خۆم لێگێلكرد، دووبارە بانگی كردمەوە، ئەوەی تەنیشتم گوتی: بانگی تۆ دەكا، كە سەرم هەڵبڕی هێمای بۆ كردم، بەلاّم من هەڵنەسام.

وەرگێڕەكە گوتی: تۆ حەز ناكەی ئازادبی؟!!

گوتم: نەخێر، هاوڕێكەی تەنیشتم زۆر نەخۆشە، ئەو لە بری من ئازادبكەن.تووڕەبوو, گوتی: بۆ بە ئارەزووی تۆیە؟!بەپەلە وەرە ڕیزەكەوە. ناچاركرام و چوومە دەرەوەی هۆڵەكە، زۆر پاڕامەوە كە هاوڕێ نەخۆشەكەم لە بری من بێ، بەلاّم سوودی نەبوو، ناو و ناونیشانیان وەرگرتم.

جەللادێكی چەكدار بە زمانی عارەبیی چەن جنێوێكی پێدام و بە تووڕەییەوە پاڵێكی پێوەنام بۆ ڕیزەكە. لە پشتی (خەدیجە) و لە ڕیزەكەدا وەستام،زۆریان پێخۆشبوو منیش وەك ئەوان ئازادەكرێم. پاش هەڵبژاردنی (حەفتا)كەس ، بە سێ ڕیز بە ڕێڕەوی هۆڵەكە دەڕۆیشتین بەرەو دەرەوەی مەركەزەكە. كەسەكانمان زۆر دڵخۆشبوون، هەر یەكەو هاواری دەكرد، ڕاسپاردەی خۆی دەگوت،جەللادەكان نەیانهێشت بوەستین، پەلەیان لێدەكردین.

گوێڕایەڵ بووم بۆ دەنگەکان ، دەمویست دەنگی دایك و باوکم ببیستم،لە ناکاو،دەنگێ هات، زۆر لە مێژ بوو تامەزرۆی بووم، گوتی: کچەکەم گەر ڕۆیشتییەوە، خۆت بگەیەنیتە (ڕێباز) ی برات، چەن جارێك دەنگەکە دووبارە بوەوە.

منیش هاوارم کرد: باشە دایکە گیان، باشە.

جەللادەکە هاواری لێکردم ، منیش بێدەنگ بووم.

گوێم هەڵخستبوو بۆ بیستنی دەنگی باوکم تا لە نێو ئەو دەنگانەدا بیدۆزمەوە، چونکە زۆر بیری دەنگی بە سۆزییم دەکرد، زۆر گەڕام بە دوای دەنگی باوکم، بەڵام نەمبیست و تەنیا دەنگی دایکم دۆزییەوە.

(١١)

چــووینە دەرەوەی مەرکەزەکــە، گۆڕســتانی والآ لــە دوورەوە دیاربوو، سەگی بیابان کۆمەڵ کۆمەڵ بە سەر لاشەکانیانەوە بوون، کراسی کچان و شەروالّی پیاوان بە خوێنی گەش سوور ببوون و تێکــەڵ بــە تیــشکی ســووری خۆراوابــوون ببــوون و شــەوقیان دەدایەوە، گۆڕستانێکی والآی سووریان دروسکردبوو.

ســواری پاســەکان بــووین، پاســەوانەکان تایبــەت بــوون ، ئــەم پاســەوانانە تــوڕە نــەدەبوون و زۆر هــێمن و لەســەرخۆ بــوون، سوچــێکی پەردەکــەم لابــرد و تەماشــای گۆڕســتانەکەم دەکــرد، (نــەریمان)ی دەســگیرانم و (دڵخــۆش)ی دەسەخوشــکم هەســتانە سەرپێ، دەسیان بەرزکردبوەوە ورایاندەوەشاند،بە زەردەخەنەوە دوا مالآواییــان لێکــردم،منیش فرمێــسکێ زۆرم بــۆ ڕشــتن، تــەواو دوورکەوتینــەوە، دوا ســەرنجمدا و گۆڕســتانی والآی ســوور دیــار نەما. (خەدیجــە) لــە تەنیــشتمەوە دانیــشتبوو، بــە هــێمنی بــانگی کــردم، جــارێکی دی بانگیکردمــەوە، بــە سوچــی پەردەکــە چــاوم ســڕییەوە ،هەناســەیەکم هەڵکێــشا، ڕووم کــردە لای (خەدیجــە) و گوتم: فەرموو چییتدەوێ؟

گوتی: بۆ وا دڵتەنگی، ئێمە وا ئازادەبین!!

گوتم: گۆڕستانی شەهیدان دەبینی، کە سەگی بیابان بە سەر لاشەکانیانەوەیە، ئەی چۆن نەگریم و دڵتەنگ نەبم!!.

هەردووکمان بێدەنگ بووین، نەمانتوانی بەردەوامبین لە گفتوگۆ. پاسەکە زۆر بە هێواشی بە بیابانەکەدا دەڕۆیشت، دونیا تاریکیکرد، ئەستێرەکان دەرکەوتن، کە سەیری ئەستێرەکانم دەکرد، وامدەزانی کەسی منن، لە چاوەڕوانیی گەڕانەوەی من و پێشوازیمدا وەستاون.هەموو بێدەنگ دانیشتبووین، گەیشتینە سەر شەقام و بیابانمان جێهێشت.چەن کاژێری ڕۆیشتین، ڕێیەکی زۆرمان بڕی تا گەیشتینە شارێکی زۆر گەورە و فراوان، پاسەوانەکان گوتیان: پەردەکان دابخەن،کەس تەماشای دەرەوە نەکا.سەیرم دەهات کە بە کوردیێ پاراو قسەی دەکرد، یەکێکمان گوتی: ئێرە کوێیە؟

گوتی: هەرکوێیەکە مەپرسە و بێدەنگ بن و قسە مەکەن.

لە پێش تەلارێ، کە گۆڕەپانێ پانوبەرین و باخێکی ڕازاوەی هەبوو، وەستا. ناوی سێ کەسیان دەخوێندینەوە ، پاسەوانێ دەیبردینە نێو تەلارەکەوە،دەرگای ژوورێکی بۆ دەکردینەوە. (من و خەدیجە و ئاسکە) چووینە ژووری ژمارە سیازدە، پاسەوانەکە دەرگای لێداخستین و ڕۆیشت.هەرسێکمان ماینەوە، ژوورێکی زۆر تایبەت و خۆشبوو، تا ئەو کاتە ژووری لەو شێوەیە جوان و

ڕازاوەم نەبینیبوو،هەموو پێداویستییەکی تێدابوو ، زۆر ترساین، گوتمان دەبێ چییمان لێبکەن؟!!

پاش چەن خولەکێ ،دەرگا کرایەوە، گەنجێکی قات لەبەر بە جانتایێ دیبلۆماسییەوە هاتە ژوورەوە، بە کوردی گوتی: من دکتۆرم، هاتووم ئێوە بپشکنم، تەنیا من بۆم هەیە هاتووچۆی ژوورەکەتان بکەم.

گوتم: چیی لە ئێمە دەکەن؟

گوتی: من هیچ نازانم، تەنیا گوتوویانە ئەوانە ئازادەکرێن. جانتاکەی کردەوە و سەماعەیەکی پشکنینی دەرهێنا، گوتی: ئامادەبن تا بتانپشکنم. دوای ئەوەی هەر سێکمانی پشکنی، لە پارچە پەڕاوێ هێندێ شتی نووسی،پاشان گوتی: من چییتان پێدەڵێم دەبێ ئێوە جێبەجێی بکەن.

یەکەم: "هەر ئێستا دەچن بۆ گەرماو ، جلەکانتان فڕێ بدەنە ئەو سەلەیەی لای دەرگاکە، دەرگای کەنتۆرەکانی کردەوە، سێ دەسە جلی جەلەبی عارەبیی تێدابوو، گوتی: ئەمانە لەبەربکەن، پاش کاژێرێکی دی، دەسنێن بەم پلاکەوە، ئەوە زەنگە و تەنیا من ئاگادار دەبمەوە و بۆ لاتان دێم.چووینە گەرماوەکە ،هەموو پێداویستیی تێدا بوو ، پاش خۆشۆرینێکی زۆر باش، جلە عارەبییەکانمان لەبەرکرد. لە ئاوێنەی ژوورەکە سەیری خۆم دەکرد، زۆر لاواز ببووم و بالام بەرزتر ببوو. زەنگێکمان لێدا، لە

مـاوەی پێـنج خولەکـدا گەیـشتە لامـان و پیرۆزبـایی لێکـردین، تێلێفۆنی کرد ، خواردنەکەی ژووری ژمارە سیازدە بێنن.

سینییێ خواردنیان هێنا، دکتۆرەکە، گوتی:ئێستە زۆر لەسەرخۆ خواردنەکـەتان بخۆن، چونکە ئێـوە زۆر برسـی بوونـە، پـاش نـان خواردن، (۲ پەرداغ) چایان بۆ هێنـاین. سـێ ڕۆژ بـەو شێوەیە ئـەو دکتۆرە سەرپەرشتیی دەکردین.

(ئاسکە) گوتی: وا دیارە چارەنووسمان ڕوو لە باش بوونە، بەڵام ئاخ! لە ژیانمدا هەموو هیوایـەکم ئـەوە بـوو ببم بـە دایك، دایکێکی دڵسۆز بۆ جگەرگۆشەکەم، بەڵام ئێستە کە هەست لە خۆم رادەگرم، دەبم بە دووگیان، لەگەڵ چاو هەڵێنانی کۆرپەکە بەم دونیایە، دەس دەنێمە سەر دەمی تا دەیخنکێنم.

(خەدیجە) گوتی: من وەك تۆ ناکـەم، بەخێوی دەکەم تا تەمـەنی هەرزەکاری،پاشـان چـەقۆیێ لـە سـەر دڵـی دەدەم، لـە بـری باوکـە جەللادەکەی دەیکوژم.

گوتم: وەك ئێوە ناکەم، هەر لە سکمدا دەیمرێنم و لە باری خۆمی دەبەم.ببوورینە سێ دایکی دڕنـدە، پیلانمـان بۆ کوشـتنی کۆرپـەیێ دادەنا کە هێشتا نەهاتۆتە دونیاوە.لە پاش سێ ڕۆژ دکتـۆر گـوتی: کـاری مـن لەگـەڵ ئێـوە کۆتـایی پێهـات، مـاڵاوایی لێکـردین.پـاش ڕۆیشتنی، دوو ژن بە جانتایەکی گـەورەوە هاتنـە ژوورەوە، یـەکیان

کوردیی دەزانی، لە جانتاکە سێ سەرپۆشی دەرهێنا، گوتی: لە سەری بکەن.

ئێمەش کوردییانە بەستمان.

گوتی: بەو شێوەیە نابێ. عارببیانە بەستیان،پێشێکیان بۆ کرد(پێچە) کە دەدرایە سەر دەم و چاومان.

لە کاتی ڕۆیشتنیان،(خەدیجە) گوتی: ئەی کەی ئازادەکرێین؟!!

گوتی: نازانین، بە خێرایی چوونە دەرەوە بۆ ژوورەکانی دیکە.

هەموویان لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکان رایان دەکرد.لە پاش ڕۆیشتنی دوو ژنەکە، کوڕێ هاتە ژوورەوە، کامێرایەکی بە دەسەوە بوو، وێنەی بە جیاجیا گرتین وچووە دەرەوە و دەرگای لێداخستین.گوتم: دەزانن "ئەم ماستە بێ موو نییە"، هەر جاری یەکێ دێ و کاری خۆی ئەنجامدەدا و دەڕوا.

(خەدیجە) گوتی: لەو بڕوایەدام وێنەمان بڵاوکەنەوە کە ئێمەی ئەنفالکراو لەوپەڕی خۆشییداین، دەمانکەنە نموونەی ئەنفالەکان ، لەوانەیە ئێستە ئەنفالکراوان کۆمەڵ کۆمەڵ ئازادکرابن و گەیشتبنەوە گوندەکان، تەنیا هێندێکمان بەم شێوەیە ڕێکبخەن و لە کەناڵەکانی تێلێفزیۆنەوە بڵاوبکرێینەوە.( ئاسك ) گوتی: ڕاستە، بۆ ئەوەی بە ڕژێم نەگوترێ دڕندایەتیی لەگەڵ کردووین.

لە پێنجەم ڕۆژدا بوو، بە هۆی ئەو خزمەتەی دەیانکردین، تەواو گوڕمان گرتبووەوە. ئێوارە دوو کەسی هاوزمانی خۆمان هاتنە

ژوورەوە،ناوی خوێندینەوە، گوتیان:بە پێشی سەرپۆشەکانتان ڕووتان داپۆشن،یەکیان کەوتە پێشمانەوە و ئەوی دی لە دوامانەوە بوو، چووینە گۆڕەپانی پێش تەلارەکە، دوو پاس لە جۆر و مۆدیلێکی دیکە وەستابوون، کچان ڕیزیان بەستبوو، ڕوویان داپۆشیبوو،گەر نزیك نەبووینایە، یەکدیمان نەدەناسییەوە.

(( یەکێ بە زمانی کوردیی گوتی: ناوەکانتان دەخوێنمەوە و سەر بکەونە نێو پاسەکان، لە سەر کورسیەکان دانیشن، دەسکاری پەردەکان نەکەن, سەیری دەرەوە نەکەن, پرسیار لە پاسەوانەکان نەکەن، چونکە ئێوە ئازادکراون و دەڕۆنەوە بۆ شوێنی خۆتان )).

کچانی ئەنفال دڵیان زۆر خۆشبوو، نزای خێریان بۆ ئەم کۆمەڵە خەڵکەی ڕژێم دەکرد،کە چەن خزمەتیان کردووین. چووینە پاسەکەوە، پاسەوانەکان گۆڕابوون، ئەوانی دی نەبوون، نەیاندەهێشت سەرپۆشی سەر ڕوومان لابەرین, هەموو ڕووەکان بە تارای ڕەش داپۆشرابوو. پاش چەن کاژێرێ لە ڕۆیشتن، نەماندەزانی بەرەو کوێ دەچین، لە شوێنێکدا وەستاین، سەرمان سوڕمابوو، هەمان گۆڕەپان و تەلاربوو.

دیسانەوە ناویان خوێندینەوە و چووینە ژوورێکی نێو تەلارەکە، کە هەمان ژمارەی هەبوو ( سیازدە) گوتم: دەبێ پیاسەیەکیان پێ نەکردبین و نەگەڕاندرابێتینەوە هەمان شوێن؟!

(خدیجە) گوتی: بڕوا ناکەم، ئێمە چەن کاژێرێکە بە ڕێوەین، چەندین تەلار هەیە لە یەك شێوە دروسکراون، پاسەوانەکانش زۆربەیان کوردی دەزانن، لەو بڕوایەدام ئێرە شارێکی کوردیی بێ.

دەرگایان کردەوە و سینیێ خواردنیان هێنایە ژوورەوە.

کابراکە پێکەنی و گوتی: بۆ سەرپۆشی سەر رووتان لانابەن، ئەی چۆن ئێستە نان دەخۆن ؟!!سەرپۆشەکانمان لابرد و هێندێ بە یەکدی پێکەنین کە چۆن سەریان لێ شێواندووین.

پاش نان خواردن، کوڕێ هاتە ژوورەوە و گوتی: پیرۆزباییتان لێدەکەم کە ئێستا ئازادەبن، بەلاّم لە هەر ژوورێ، لە هەموو سەر سەعاتێ، یەك کەستان ئازادەبن. سێ فایلی پێبوو. فایلی یەکەم وێنەی منی بە سەرەوە بوو، سەیری ناوەکەی کرد و گوتی: (نەسرین کاوێن) کێتانن. حەزم نەدەکرد یەکەمین کەس بم بۆ ئازادبوون، بەلاّم بە ناچاری گوتم: بەڵێ منم.

گوتی: ڕووت داپۆشە و بکەوە دوام. باوەشم لە (خەدیجە و ئاسکە) دا گوتم: ئینشەڵلا دەتانبینمەوە، مالآواییم لێکردن. کوڕێکی زۆر هێمن بوو، لە چاوەڕوانییمدا بوو، هاواری نەدەکرد. کە چووومە دەرەوە، قەمەرەیەکی زۆر لە گۆڕەپانەکە بوو، "دوا مۆدیل، جام ڕەش"بوون. دەرگای پێشەوەی قەمەرەکەی بۆ کردمەوە، شۆفێرێکی تێدابوو، فایلەکەی دا بە دەس شۆفێرەکە و گوتی: دەربچۆ, ئەویش بە پەلە پێی لە بەنزین نا و چووینە

دەرەوەی گۆڕەپانی تەلارەکە. لە سەر شەقامی دەرەوە، قەمەرەی دیکەش ڕیز ببوون، چەن ئۆتۆمۆبیلێکی (پیکاب و لاندگرۆز)ی چەکدار لە پێش و دوامانەوە بوون، دەسیان کرد بە ڕۆیشتن، بە شۆفێرەکەم گوت: بۆ کوێ دەچین؟!!

وەڵامی نەدامەوە. زانیم ئەمیش یا زمانەکەمان نازانێ، یا لە وەڵامی پرسیارەکەم خۆی گێل دەکات. زۆر دەترسام، سەرم سوڕمابوو، بۆ  بە تەنیا لەگەڵ ئەم شۆفێرە دام، بۆ کوێ دەمانبەن؟! ئاخۆ چ چارەنووسێکی ڕەشی دیکە چاوەڕوانمانە!!ئایا دەبێ بە مەراسیمێکی شکۆدار و ڕێزلێنانەوە بمانگەیەننەوە. چەندین پرسیار لە مێشکمدا پەنگی خواردبوەوە و لە چاوەڕوانیی دوا وەڵام بوون. بە تیلی چاو سەیری شوفێرەکەم کرد، بەڵام ئەو بە هیچ شێوەیێ تەماشای نەدەکردم و قسەی نەدەکرد، تەنیا تەماشای پێشی خۆی دەکرد.پاش ماوەیێ لە ڕۆیشتن، گەیشتینە زاڵگەیێ، هیچ ئاوەدانیێ نەبوو، تەنیا ئەو زاڵگەیە نەبێ، لە دەشتایێ پانوبەرین کە بەسیم تەنرابوو، وەك ڕۆژ وابوو هێند گڵۆپی بە شەوقی بۆ دانرابوو. بانگی شۆفێرەکەیان کرد، گرتی بە فایلەکە و بە پەلە چووە خوارەوە، کابرایەکی "درێژی لاواز، ڕەشتاڵەی دشداشە لەبەربوو". دڵم زۆر ترسا، گوتم:چۆن ئازادبوون بەم جۆرە دەبێ، ئەم ناوچەیە لە ناوچەی ئێمە ناچێ. واچاکە ڕابکەم و ڕوو لەو دەشتە بکەم چیی دەبێ با ببێ!!. لە

شوێنی کردنەوەی دەرگاکە دەگەڕام، دەسم لە ئەڵقەییٚ گیرکرد و ڕامکێشا، دەرگاکە کرایەوە، ویستم دابەزم، دوو پاسەوان گەیشتنە سەرم و دەرگاکەیان لە سەر داخستم، هەڕەشەیان لێکردم کە نەیکەمەوە. لەو کاتە کابرای شوفێر هاتەوە، پاسەوانەکان چرپاندیانە بنگوێی، تێیگەیشتم کە پێیان گوتووە بە نیازی ڕاکردن بوومە، چونکە یەکسەر پەنجەی نا بە دوگمەیەك و هەر چوار دەرگای داخست .دەسی بە ڕۆیشتن کرد، بەڵام ئەم جارە چەکدارەکان لەگەڵمان نەهاتن، سەرم سوڕما، بۆ تەنیا قەمەرەکان بیٚ چەکدار بە ڕیٚ دەکرێن. سەیرێکی کردم، بە هێمایەك گوتی: سەرپۆشی سەر ڕووت لابە، لام برد و تەماشام کرد، گوتم: بۆ کویٚ دەچین؟ سەرنجێکیدا، گوتی: (هەلە ــ هەلە )، دەسی برد بۆ (ڕیکۆردەر)، کاسێتیٚ عارەبی لێدەدا، وەڵامی نەدامەوە و لەگەڵ گۆرانیەکە کەوتە چەقەنە لێدان، دڵی تەنگکردم، دەسی بۆ ڕوومەتم هێنا، بە توندیی دەسیم لابرد. ڕووی تێکردم وتێیگەیاندم: ئێرە (کوێتــە) و عێراقمــان جێهێــشت. لــەو کاتــەدا (قەمەرەیــەکی هاوڕێکەی) بە تیژی و بە هۆڕین لێدانەوە بە تەنیشتماندا تێپەڕی، ئەویش بە هۆڕن وەڵامی دایەوە و پتر هاتبووە جۆشوخرۆش. سەیرێکی کردم و گوتی: هەلە ـ هەلە ـ ب (جاریەتی)، کە چەن جاریٚ ووشەکەی دووبارە کردەوە، (مەلا ئەحمەد) ی گوندەکەمان هاتەوە یادم، کە باسی ئەنفالی دەکرد و دەیگوت: جاریە، واتە

فرۆشتنی مرۆ، ئەو مرۆڤانەی کە لە شەڕدا بە دیل دەگیرێن، ئینجا زانیم ئێمە فرۆشراوین بەم عارەبە کوێتییانە. هاوارم کرد، ویستم خۆم فڕێ بدەم و خۆم بکوژم، گرتم بە قفڵەکەدا و ڕامکێشا سوودی نەبوو، ویستم قەمەرەکە وەربگەڕێنم، خۆمدا بە سەر شوفێرەکەدا و چەن جارێ سوکانەکەم لە دەستی سووڕان، هێندێ زیگزاکم بە ئۆتۆمۆبیلەکە کرد.خۆیدا بە سەر سوکانەکە و نەیهێشت وەربگەڕێ،زۆر هێواشی کردەوە،ڕیکۆردەری کوژانەوە و لە چەقەنە لێدان کەوت.ڕەنگی زەرد بوو، دەسێکی بە سوکانەکەوە، دەسێکی پارێزگاریی خۆی پێدەکرد،هێمای بۆ کردم کە دانیشم و لە سەرخۆبم. هەناسەیەکم هەڵکێشا, دەنگی بە سۆزی دایکم گوێی زرینگانمەوە، کە دەیگوت: "خۆت بگەیەنە ڕێبازی برات"، چەن جارێ گوێی زرینگانمەوە و دەسمکرد بە گریان، گریانم نەدەوەستا، بەزەییم بە خۆمان دەهات، ئێمە چییمان کردووە ئەم چارەنووسە ڕەشەمان هەیە؟! تۆ بڵێی ڕۆژێ بێ و بگەمە دایکوباوکم و ڕێبازی برام، لە گوندەکەمان ژیان بە سەر بەرینەوە.

بڕیارمدا خۆکوشتن لە مێشکم دووربکەمەوە، هیوای گەڕانەوەم بۆ باوەشی خێزانەکەم و گوندەکەم بکەمە هیوایەکی گەشاوە، دان بە خۆمدا بگرم و چارەنووسم بدەمە دەسی ڕۆژگار.

(١٢)

نیوە شەو تێپەڕ ببوو، گەیشتینە شاریێ، شارێکی کشومات، هیچ کەس بە ئاگا نەبوو، تەنیا گڵۆپی سەر شەقامەکان بە ئاگابوون، ئەو شارەیان کردبوو بە ڕۆژ. شەقامەکان پانوبەرین، چەندین کۆشك و تەلاری بەرزی لێبوو، تا ئەو کاتە شوێنی لەو شێوەیەم نەبینیبوو. نامۆیی دوورە وولآت ، زوڵم و زۆرداری ڕژێم، کاری لێکردم و پتر بەزەییم بە خۆم و گەلەکەم دەهات، بۆچی وەك گەلانی جیهان سەربەست و ئازادنین!! هەناسەم تەنگبوو،گریان قوڕگی گرتم، کراسی غەریبیی،دەسودڵ و گیانی بەستبووم.

هەر لە نێو ئەو شارە، لە شوێنێکی زۆر خۆش، ڕووی کردە دەرگایەك و وەستا، بە هێما گوتی: ئەمە ماڵی ئێمەیە، خۆی دابەزی و دەرگای حەوشەی کردەوە و چووینە ژوورەوە. خانوویێ یەکجار خۆشبوو،کەوتە پێشم کە بچمە ژوورەوە،بەڵام لە حەوشەکە وەستام و نەچوومە ژوورەوە، زۆر ترسام ماڵیان چۆڵبێ، چەن جاریێ هێمای دەکرد و دەسی بە توندی ڕادەوەشان تا بچمە ژوورەوە،بەڵام سوودی نەبوو.لەم مشتومڕەدا بووین، دەنگی منداڵێ هات، بانگی باوکی دەکرد، زۆر دڵم کرایەوە، زانیم ماڵەوە

چۆڵ نییە، چوومە ژوورەوە. کە منداڵەکە منی بینی زۆر سەری سوڕما،هەردووکیان کەوتنە پێشمەوە،بردیانمە ژوورێکەوە لە تەنیشت چێشتخانەکەیان، تایبەت بوو بە کارەکەر، بەڵام خۆزگەم بە کارەکەر، من کۆیلە بووم و فرۆشرابووم. تێیگەیانم: ئەم ژوورە، ژووری تۆیە. گەرچی ژوورەکە بچووکبوو، بەڵام "قەرەوێڵە و تێلیڤزیۆن و کۆندێشن و کەنتۆری" تێدابوو، بە منداڵەکەی گوت: برۆن منیش ئێستە دێم، کە ئەو ڕۆیشت،وەك ڕێوی فێڵباز، بە قسەی خۆش هاتە نزیکمەوە، ویستی پەلامارمدا. بە هێمایەك تێمگەیاند (بچۆرە دەرەوە)،گەر نەچی ئێستە هاواردەکەم، بڕوای نەدەکرد،تەواو نزیکبووەوە،پاڵێکم پێوەینا و ڕامکرد بۆ لای دەرگای ژوورەکە، ویستم هاواربکەم، لەو کاتە منداڵەکە بانگی باوکی کرد، ئەمیش بە ئاسپایی ملی شۆڕکرد و چووە دەرەوە. دەرگام داخست، ویستم قفڵی بدەم،بەڵام نەمدەزانی چۆن قفڵ دەدرێ، زۆر سەیری دەرگاکەم کرد،بازنەیێ لە خوار کیلۆنەکەوە هەبوو،چەن جارێ سووڕانم،دەرگاکەی قفڵ کرد.لەو ژوورە بە تەنیا بووم،دوور لە هەموو کەس، چنگی ڕەشی غوربەتیی دڵی دەگوشیم، قورگی پڕ لە گریان کردبووم،لە سەر دەم خۆمدا بە سەر قەرەوێڵەکەدا وبە گریەو ئەشك ڕژانەوە نوستم.لە لێدانی دەرگاکە بە ئاگا هاتم، سەیری دەوروبەرم کرد، نەمدەزانی بۆ لەو ژوورەدام،کە بە هۆش خۆم هاتمەوە، ئەو کات زانیم کۆیلەم و بەم

ماڵـە فرۆشـراوم. دیـسانەوە،بە تونـدیی لـە دەرگاکـە درا، دەنـگ و هـاواری ژنـیٚ تێکـەڵ بـە دەنگی لێدانی دەرگاکە ببـوو، بـە ترسەوە چـووم دەرگاکـە بکەمـەوە، بازنەکـەم سـووڕان و دەرگاکـەم کـردەوە. ژنێکـی "قەڵـەوی لچ ئەستوور، دەموچـاو پـان، ڕەش پێـست، زۆر خـراپ تـووڕە ببـوو و بێئـەوەی خێرهـاتنم بکا،هاواریـدەکرد،منیش هـیچ قـسەم نـەدەکرد و هـەر سـەیریم دەکـرد، نەمـدەزانی لەبـەر درەنگکردنەوەی دەرگاکە شێتگیر بووە.مێردەکەی بە تیلی چاوی تەماشای دەکردم،دیاربوو زۆر لە ژنەکەی دەترسا، لە هـاوارکردن و تووڕەبوونی دایکیـان، سـیٚ منـداڵیان هـات، دوو کـچی تەمەن (٨ ـ ١٠) سـاڵ و کـوڕیٚ مێـرد منـداڵ، کـە منیـان بـینی، بـە چـاوێکی بەزەیییانـەوە دەیـانڕوانیم، لـە جوانییەکـەم حەپەسـابوون، لـە چـاو دایکیانــەوە شــاجوان بــووم.لێـشاویٚ لــە غوربــەتی، لێـشاویٚ لــە ئەسرین ڕووی تێکردم ، گریانمی،چاوی کچەکان پڕ لە فرمێسك بوو،کوڕەکە لە دایکی توڕەبوو،دەمزانی پشتی من دەگرن, هەستی پـاکو بێگـەردیان لای مـن بـوو.ژنەکـە زانـی زمـان نازانم،هێمـای بـۆ کردم تا بکەومە دووی.هەر سـیٚ منداڵەکەی و مێردەکەی لەگەڵمان هـاتن، دڵـم خۆشـبوو مێردەکەی زۆر لێـی دەترسـیٚ، منداڵەکانیشی منیـان خۆشـدەویٚ.چـووینە چێـشتخانە و گـەرماو، تێیگـەیانم کـە تەنیا کارم لەو دوو شوێنەیە و پێوەندییم بە هیچ شوێنیٚ دیکەوە نابیٚ، منیش تێمگەیان کە نازانم کەرەسەکانی چێشتخانە و گەرماو

بەکار بێنم چونکە لە وولاتەکەمان کەرەسەی وامان بە کار نەهێناوە. تووڕەبوو، ڕووی کردە مێردەکەی گوتی: ئەمە چۆن (جاریە)یەکە هێناوتە!! بە منیشی گوت: بۆ هیچ نازانی؟!! تێمگەیاند کە دەبێ لە سەرەتاوە یەکێ فێرم بکا، ئینجا بە سەرچاوان دەستەکەم بە کارکردن.هێندێ قسەی لەگەڵ مێردەکەیدا کرد، ئەویش بە پەلە چوو بۆ دەرەوە، خۆیشی چوو بۆ ژوورەکەی، منیش بە دڵتەنگی بەرەو ژوورەکەم چوومەوە.دڵم زۆر ترسا بە ماڵێکی دیکەم بفرۆشن.منداڵەکانی ویستیان بۆ ژوورەکەم بێن، لە دوورەوە دایکیان لێیان تووڕەبوو، ئەوانیش بۆ هێوربوونەوەی دڵی من، دەسە خنجیلانەکانیان بەرزکردەوە و چوونەوە بۆ ژوورەکانیان. منیش چوومە ژوورەکەم و پاڵمدایەوە گوتم: خوایە گیان ئەم قولە ڕەشانە ژیانیان چۆنە، سەرەڕای ئەوەی پیسترین ڕەفتاریان هەیە، ئێمەی کوردیش چەن دڵپاکین،ئینجا چارەنووسێکی ڕەشت پێبەخشیوین.کەوتمە گێژاوێکی خەیاڵەوە ، بیرم ئاڵۆزببوو, بیری خەباتە خنجیلەکەم دەکردەوە، ڕاسپاردەکەی (شەهید دڵخۆش) هاتەوە یادم،کە ئێستە دوورم لەو خەباتە وتەنیام، نەك بەندکراو، بەڵکو کۆیلەم و فرۆشراوم!!.

کچێکیان هاتە ژوورەوە، بە پەلە فرمێسکی چاوانم سڕییەوە، ئەویش سەرنجیدامێ،بەزەیی پیمدەهاتەوە،بە هێما گوتم: دانیشە.لە جێی خۆی وەستابوو،جووڵەی بۆ نەدەکرا، بە دەسە

خنجیلەکەی هێمای بۆ کردم کە لە دەرەوە بانگم دەکەن،لەگەڵم هات بـۆ چێـشتخانەکە،دایکی هــەر لــە دوورەوە پێیگــوت:بــچۆ بـۆ ژوورەکەت،بــە هێواشـــی و بــە بێــدەنگ گەڕایــەوە. چـــوومە چێشتخانەکە، مێردەکـەی، ژنێکـی هێنـابوو، بـە خـاڵی نێوچـاوانی زانیم (هیندیی) یـە، ژنـە هیندییەکە زۆر بە ڕێزەوە هەستا،لە سەر شێواز و دەسـتووری خۆیـان هـەر دوو دەسـی لای چـەنەگەی دانـا و کـەمێ چـەمییەوە، منـیش بـە دەسم سلاوم کـرد و زەردەخەنەیـەکم بۆکرد، ژنە کوێتییەکە بە فیزێکەوە تێیگەیانم: ئەم هیندییـە چوار ڕۆژ دەمێنێتــەوە،تا تــۆ فێربکا،هەســتایە ســەر پــێ، ســەیرێکی پیاوەکــەی کرد،ئــەویش لــە ترســان هەســتا و بــۆ ژوورەکــەیان چــوونەوە،من و هیندییەکـە ماینــەوە.تەماشـای کـردم و دەیزانــی ژیـانی سـەرەتای غـەریبی یـەکجار گرانـە، باوەشیکردەوە،گوشـیمیە خـۆی،منیش ئـەوم گوشـییە خـۆم، لـە ئـامێزی یەکـدیا کـەمێ بێدەنگبووین،پاشــان لــە یەکـدی بووینــەوە, هەردووک،چـاوانمان فرمێسکی غەریبیی لێدەباری ، تێیگەیانم لەم ماڵە (کارەکەر) بووە.

زۆر دڵسۆزانە کارەکانی فێرکردم، ئەو ڕۆژە هـەموو کارەکانمـان پێکەوەکرد،کــە تــەواوبووین، چــووینەوە ژوورەکــەمان, وەك دوو کەڕوڵاڵ یەکدیمان تێدەگەیان،گوتی: دوو ساڵ لەم ژوورەدا بووم، بەڵام ئاگاداری خـۆت بـە، پیاوەکـە بێئـابڕووە, شـەوانە دەرگـا کلیـل بدە،چـونکە شـەوێ درەنـگ دێ و لــە دەرگـا دەدا، نەیکەیتــەوە!!.

دەفتەر و پێنووسی دەرهێنا و دەسیکرد بە نووسین، گوتم: تۆ چیی دەنووسی؟ گوتی: هەر چیی بە سەرهاتی رۆژانەم هەیە بۆ یادگاری دەینووسمەوە.وەك دوو دەسەخوشکی دڵسۆز، چوار شەو پێکەوە بووین، شەوانە تا درەنگ بەسەرهاتەکانمان بۆ یەکدی باسدەکرد، لە پاشان لە سەر قەرەوێڵەکە دەسمان لە ملی یەکدی دەکرد و دەنووستین. ئەو چوار شەوە، زۆر هۆگری یەکدیی کردین،نامۆیی لە بیرم بردبوەوە، بەلاّم ماوەکە تەواوبوو ، مالاّوایی کرد و جێی هێشتم و نەمبینییەوە. ئێواران لە ژوورەکەمدا جێی دیاربوو، زۆر جاران بۆی دەگریام، هەمیشە سوپاسیم دەکرد کە دڵسۆزانە لە ماوەی چوار ڕۆژ کارەکانی ئەو ماڵەی فێرکردم، بە ئارەزووی خۆم کەرەسەکانم بە کاردەهێنا و باشترین خواردنم دروسدەکرد.منداڵەکان هەمیشە دەسخۆشکەریان لێدەکردم، بەلاّم ژنەکە نا, پیاوەکەش دەترسا.

(١٣)

ئەو بەیانییە ژن و پیاوەکە لەگەڵ کوڕەکەیان بە نیازی چوونە بازاڕ بوون،دەرگای حەوشەم بۆ کردنەوە و ڕۆیشتن.پاش تەواو بوونی ژەمی بەیانی،چوومەوە ژوورەکەی خۆم ،هەر دوو کچەکە هاتن بۆ ژوورەکەم،حەزیان دەکرد بزانن من لە کوێوە هاتووم و چۆن هاتووم.بەسەرهاتەکانم تێگەیاندن، بەو منداڵییە گوێیان هەڵخستبوو،چاویان کردبوەوە،ڕەنگیان تێکچووبوو بۆ بەسەرهاتەکانم،حەزم نەدەکرد هەموو شتێکیان بۆ باسکەم. داواکارییەکم لێکردن، کە پێویستیم بە (پێنووس ودەفتەر) ە، یەکیان بە پەلە چوو چەن دەفتەر و پێنووسی بۆ هێنام، حەزم دەکرد ئەو دەفتەرانە بکەمە نووسینەوەی یادەوەرییەکانی ڕۆژانەم، هەر وەك کچە هیندییەکەی هاوڕێم. هەر لەو ڕۆژەوەی لە گوندەکەمان ئەنفالکرابووین نووسیمەوە تا ئەوساتەی ئەو دوو کچە لە تەنیشتمەوە دانیشتبوون.ناویانم پرسی،ناویان (ساهیرە و ماهیرە) بوو.باوکیان (عەبدوڵڵا) ،دایکیان (عایشە)، براکەیان (محمد)، منیش ناوی خۆم لە بەرگی دەفتەرەکە نووسی کە ناوم (نەسرین)ە. دەفتەرێکم بۆ نووسینی ووشەی عارەبیی و ماناکەی

بە کوردیی تەرخانکرد، زۆر ووشەم دەپرسی و دەمنووسییەوە بۆ ئەوەی فێری زمانەکەیان بم. سەیریان بە نووسینەکەم دەهات ، تێمگەیاندن کە من لە گوند دەژیام ، مامۆستای گوند بە ناوی (مامۆستا هیوا)، فێری خوێندن و نووسینی زمانی خۆمانیی کردووین کە کوردییە. زۆر سوپاسی مامۆستا هیوام کرد، گەر ئەو نەبوایە ئێستە من چییم بکردایە و چییم بنووسیایە، ئازارەکانی دڵودەروونم بە چیی کەم بکردایەوە. زەنگی دەرگا لێدرا، کچەکان لە ترسی دایکیان بە پەلە بۆ ژوورەکەیان چوونەوە، منیش بە خێرایی چووم دەرگام کردەوە ، چییان هێنابوو، لە سنوقی قەمەرەکە دەرمهێنا، دەسمکرد بە دروسکردنی خواردن. پاش نان خواردن و تەواوبوون لە کارەکان، چوومەوە ژوورەکەم پشوویێ بدەم، (ساهیرە) هات بۆ ژوورەکەم و گوتی :دایکم لە (گەرماو) بانگت دەکا. چوومە گەرماوەکەوە، زۆر ترسام،لەشی زۆر ترسناکبوو،سکی زلوپەش،قژی ئاڵۆز، وامدەزانی خێوە،هەر بەو خێوانە دەچوو لە گوندەکەمان باسیان دەکرد و منداڵیان پێدەترسان.گوتی: دەس بکە بە شۆرینم، بە ناچاری بە قسەیم کرد، چەن دەمشۆری پێستەکەی سپیی نەدەبوەوە، قێزم لە خۆم دەبوەوە کە کۆیلەم و کۆیلەی ئەم پیسەم. پاش تەواو بوون لە شۆرینی،هێمای کرد،بە خاولیەکەی وشکیبکەمەوە،پاشان (ووشککەرەوە_موجەفیفە) کەی کردە ئیش و گوتی:قژەکەم خاو

بکەوە،ئارەقیێ زۆرم کرد،زۆر ماندووبووم،وێڕای ئەوەش جاروبار لێم تووڕەدەبوو، بە یەکجاری خۆم لەبەر چاوکەوت، گەر دەسەڵاتم هەبوایە، هەر لە گەرماوەکە دەمخنکان. بێ سوپاس، بە فیزێکەوە گوتی بڕۆ، بەو ماندووبوونەمەوە چووم بۆ چێشتخانەکە، بۆ دروسکردنی خواردنی ئێواریێ. پاش کۆتایی هێنان بە نان خواردن و کارەکانی دوای نانخواردن، چوومە ژوورەکەم. لەبەر ماندووبوون لێبڕاکشام ،پاش پشوودانێکی کاژێری، هەستام و دەفتەری یادەوەرییەکانم هێنا،کارەکانی ئەو ڕۆژەم نووسییەوە، پاشان دەفتەری ووشە و ماناکەیم هێنا،تا فێری چەن ووشەییێ لە زمانەکەبم. تێلێفزیۆنەکەم داگیرسان،چونکە زۆر ماندووبووم، توانای دانیشتنم نەما و کوژانمەوە،دەرگای ژوورەکەم قفڵکرد و نووستم.لە لێدانی دەرگاکە بە ئاگا هاتم، وامدەزانی بەیانییە و لەبەر ماندووبوون نەمتوانیوە بە ئاگا بێم،سەیری کاژێرم کرد،سێی شەو بوو،کە گوێم لە دەنگی (عەبدوڵڵا) بوو، قسەی کچە هیندییەکە هاتەوە یادم،دەیویست بیکەمەوە،وایدەزانی منیش وەك ئەو تامەزرۆم،پاشئەوەی ماوەییێ وەك سەگ لەبەر دەرگاکە دەنوزایەوە، زانی سوودی نییە، ڕۆیشت.بەیانی هەستام زۆر دڵخۆشبووم کە تاوانێ گەورەم لە ئەستۆدا نەما،چونکە تووشی سوڕی ئاسایی مانگانە بووم.خوێنم زۆر لەبەر دەڕۆیشت،پێدەچوو لەگەڵیدا تووشی خوێنبەربوون بووبم، بە پەلە خۆم گەیاندە گەرماوەکە،

دڵنیابووم لە کۆرپەکەی سکم ڕزگاربووم ئەو ڕۆژە پتر دڵخۆشبووم کە پێنج ڕۆژ دەچن بۆ ماڵی باوکی ژنەکە، هەر وەك كاری ئاسایی سەردانییان، لە پاش نیوەڕۆ خۆیان ئامادەکرد و ڕۆیشتن.منیش چوومە گەرماو ، خۆم پاك شۆری, بە هۆی عادەکەمەوە پێویستیم بە پشوودان هەبوو، کارەکان و بەسەرهاتەکانی ئەو ڕۆژەم لە دەفتەری یادەوەرییەکانم نووسییەوە، لە سەر قەرەوێڵەکەم پاڵمدایەوە و دەفتەری ووشە و ماناکەم دەخوێندەوە.

## (١٤)

لە سێیەمین ڕۆژدا،دەنگی زەنگی دەرگا هات، دەرگام کردەوە، بە خێرایی ئۆتۆمبیلەکەی هێنایە ژوورەوە، گرنگیم پێنەدا ئەوانی دی لەگەڵدایە یا نا،کە تەنیا خۆی دابەزی، ترسم لێنیشت. نەمدەزانی چیبکەم،یەکسەر چوو بۆ چێشتخانەکە، بەلام من نەچوومە ژوورەوە.

گوتی:برسیمە، وەرە خواردنم بۆ ئامادە بکە.

گوتم: دەترسم.

گوتی: من برسیمە.

گوتم: نایەم وازم لێبێنە، بچۆرەوە لای منداڵەکانت.

توورەبوو، چەن جارێ گوتی: تۆ (جاریە) ی منی وەرە ژوورەوە. بە ترسێکی زۆرەوە چوومە چێشتخانەکەوە، خەریکی دروسکردنی خواردن بووم،بەلام چاوم لەو چەقۆ گەورەیە بوو،بە دیوارەکەوە هەڵمواسیبوو،لە دڵی خۆمدا گوتم:گەر ویستی پەلامارمدا،بەو چەقۆیە دەیکوژم و ڕادەکەم. لە سەر کورسییەکە دانیشتبوو، جاروبار پەرداخەکەی لە ئاوی دۆلکەی سەر مێزەکە پڕدەکرد و دەیخواردەوە، چاوێکی هەر لای بینینم بوو،بە چاوێکی

فیلاوییەوە سەیریدەکردم، خواردنەکەم لەبەر دەسی دانا، لەگەڵ خواردنی هەر پارووییٚ، دەسخۆشکەری لێدەکردم .پاش نانخواردن، داوای چای لێکردم، چوومە لای تەباخەکەوە، ئەویش هەستا بۆ لای دەستشۆرەکە کە لە نزیکی تەباخەکەوە بوو،دڵم زۆر ترسا،هەستم لای ڕۆیشتنەکەی بوو، دەسی شۆری و بە پەلە گەڕایەوە،لە پشتەوە پەلاماریدام و گوشیمیە خۆی، هەوڵمدا خۆم ڕزگاربکەم، ئەو پتر دەیگوشیمیە خۆی،خۆم ڕاپسکان و ڕزگاربووم،ڕامکرد بۆ چەقۆکە تا دەسم لێگیربیٚ و بیکوژم،بەلاٚم نەیهێشت بگەمە چەقۆکە، گرتیمی، لە خۆڕاپسکانم و گوشینی ئەو،کەوتینە سەر زەوییەکە، ویستی خۆی بداتە سەرم،بەلاٚم دەرباز بووم و ڕامکرد بۆ ژوورەکەم، کەوتە دوام، نەیهێشت دەرگاکە قفلٚ بکەم، چونکە لە من بە هێزتر بوو، منیش لەو کاتە نەخۆش بووم.هاتە ژوورەوە، پشتی نا بە دەرگاکەوە، هەناسەی بە تەواوی تەنگببوو، دەرگاکەی قفلٚ کرد و کەوتە قسەیخۆش کە مەی خۆشدەویٚ. منیش گوتم: وازم لێبێنە، بڕۆ دەرەوە، ناپاکانە دیسانەوە پەلاماریدام، بەرەنگارییم زۆرکرد و هەوڵمدا، بەلاٚم تەواو بێتوانای کردم، دامیە سەر زەوی ، هاوارمکرد کە من هادەم،هەر سوودی نەبوو،وەك جەللادەکان ئابڕووی بردم و چووە دەرەوە،زۆر گریام، لە ئازاردا دەتلامەوە، بەلاٚم هاوار بۆ کیٚ بەرم؟!!پاش کەمیٚ هاتە ژوورەوە،تفم لێدەکرد و گوتم: بچۆ دەرەوە ئەی بێنابڕوو،

دیسانەوە شالاْویی بۆ هێنامەوە،چەن زللەیەکم بە نێوچەوانیدا کێشا، بێباکبوو، دەپاڕامەوە وازم لێبێنێ، چونکە خوێنم زۆر لێدەڕوا، سوودی نەبوو، زوڵمی لێکردمەوە و چووە دەرەوە.لە ئازاریێ زۆردابووم، ئەویش چووە گەرماو و پاش نیوکاژێریێ هاتەوە بۆ لام و گوتی:بە ژنەکەم نەڵێی کە من هاتوومەتەوە، ژنەکەم بە یەکجاری دەبیێ بە دوژمنت، منداڵەکانیش قینیان لێت دەبێتەوە، تۆ ئازارت هەیە،پێویست ناکا بۆ دەرگا بێی، هەر خۆم دەڕۆم ولە دوای خۆمەوە دایدەخەم.

تەماشای کردم و پێکەنی، منیش تفێکم لێکرد، دەنگی پێکەنینەکەی بەرزتر کردەوە و چووە دەرەوە.

تەواو بێهێز بووم، هاوارم بۆ دایك ، باوك، ڕێبازی برام و نەریمانی دەسگیرانم دەکرد،دەنگیان لە گوێمدا دەزرینگایەوە، بێزار ببووم لەو ژینە، گوتم: واچاکە بە چەقۆکە خۆم بکوژم و ڕزگاربم، هێدی هێدی بەرەو چێشتخانەکە دەڕۆیشتم، بە دەسە لەرزۆکەکەم چەقۆکەم هەڵگرت، ویستم لە سەر دڵی خۆمی بدەم،شەهید دڵخۆش ، نەریمان ، شەهیدانی خەباتە خنجیلەکەمان دەهاتنە پێشچاوم،زۆر خۆم بە لاواز دەزانی،دەسم ساردبووەوە، گوتم:دەبوایە پێش ئابڕوو چوونەکەم خۆم بکوشتایە، بەلاْم ئێستە زوڵموستەم لێکراوم،پێویستە گیانی تۆڵەم بە هێزبکەم،خۆ من دامەزرێنەری خەباتی هێزیی گیانی تۆڵەی کچان بووم،نزیکی چوار

سەد کچ ئەندامبوون،دەبیّ من بلّێم خۆم دەکوژم!!گەر بتوانم خۆم بکوژم، بە ئاسانی دەتوانم یەکیّ وەك (عەبە) بکوژم، من ئەو کەسەم هەر بە قۆناغە تفەنگ جەللادێکم کوشت.وورەی خۆم بەرزکردەوە، گوتم: دەبیّ ڕۆژیّ لە ڕۆژان عەبە بکوژم.چەقۆکەم برد بۆ ژوورەکەم و لە ژێر سەرینەکەم دانا، گەر جارێکی دی ویستی زوڵمم لێبکا، چەقۆکە لە سەر دڵی دەدەم و بە سزای خەباتی هێزی گیانی تۆڵەی کچانی دەگەیەنم، ئەم زوڵمەی ئێستەی،( با بمێنیّ بۆ ڕۆژگار).

لە پێنجەمین ڕۆژدا، نزیك ئێواریّ، زەنگی دەرگا لێدرا، چووم دەرگاکەم کردەوە ، هاتنە ژوورەوە، سڵاویان لێکردم، هەر دوو کچەکەیان بە ڕاکردن هاتن،باوەشیان لێدام ویەکدیمان ماچکرد، (عایشە) زۆری پیّ ناخۆش بوو، بە تووڕە بوونەوە گوتی: بڕۆن بۆ ژوورەکانتان، بە منیشی گوت: ئەو کەلوپەلانە لە سنووقی قەمەرەکە دابگرە، (عەبە)ش چووە ژوورەوە، (محەمەد) بەقسەی دایکی نەکرد ، لە گواستنەوەی کەلوپەلەکان یارمەتییدام. زۆر جار لە شەودا (عەبە) لە دەرگای دەدا، بەڵام نەمدەکردەوە، بە هۆی چەقۆی ژێر سەرینەکەمەوە هیچ سڵم لێنەدەکردەوە و دەنووستم. ئەویش پاش نووزانەوەو پاڕانەوەییّ زۆر دەڕۆیشتەوە.

بەم شێوەیە ژیانم لەگەڵ ئەو خێزانە بە سەر دەبرد.

(١٥)

ســالْ و نیـویْ، وەك کۆیلـەییْ لـە خزمـەتی ئـەو خێزانـە بـووم، زمانەکە بە تەواوی فێربووم، ڕۆژێکیان چوومە گەرماو، خۆم زۆر بە جوانی شۆری، کەمیْ ڕزگار ببووم لە لاوازی لەشم، (عایشە) زۆر بە قینەوە تەماشای دەکردم و دڵی لێپیسدەکردم.گوتی:زوو بچۆ بۆ سەربان و جلەکان هەڵخە، کە چووم پاش پێنج خولەکیْ خۆی بۆ سەربان هات، نەمدەزانی چیی لێم دەویْ، کەوتبووە چاودێریی کردنم ، ویستم بچم بۆ خوارەوە، ئەویش کەوتە دوام، گوتم: فەرموو، تۆ لە پێشەوە بڕۆ، بە تووڕەییەوە گوتی: تۆ بڕۆ ، پایە بە پایە بە دوامدا هات، چەن پایەییْ مابوو، پاڵێکی پێوە نام، بە تەقڵە کردمیـــە خوارەوە،هاوارمکرد،هـــەر دوو کـــچەکەی هاتن،ئـــەویش گوتی:بۆ ئاگاداری خۆت نابی؟ ئەمەی گوت وچووەوە ژوورەکەی هـەردوو کـچەکەی دەگریـان،زۆر بـەزەییان دەهاتەوە،چـونکە زۆر ئـازارم هەبوو، بەڵام دەموچاوم هیـچی بە سـەر نـەهاتبوو، کە ئـەو دەیویست بڕوشیْ و ناشیرینبم، لەو کاتە عەبە و محەمەد لە بازاڕ دەهاتنـــەوە، منیـــان بـــینی کـــەوتبووم و ڕەنگـــم تێکـــچووبوو،عەبە گـــوتی:ئاگـــاداری خـــۆت بـــە،پارەم پێـــداوی.قێـــزم لـــە خـــۆم

بوەوە،منداڵەکانیشی ئەو قسەیەی باوکیان زۆر پێ ناخۆشبوو و سەریان داخست.محەمەد زۆر پەرۆش بوو، گرتی بە دەسم هەڵمسێنێ،دایکی لە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە هاواریکرد گوتی:هەستە.. هەستە بڕۆ بۆ ژوورەکەت،بە منداڵەکانی گوت: بچنەوە ژوورەکانتان.عەبە هەر بە ڕاکردن چوو بۆ لای ژنەکەی، منیش هەستام و هێواش هێواش چووم بۆ ژوورەکەم.خۆم ڕووت کردەوە،لە ئاوێنەکەوە سەیری لەشی خۆم دەکرد، تا بزانم کوێم بریندار بووە،کە بینیم محەممەد لەبەر دەرگاکە وەستاوە، بە پەلە کراسەکەم لەبەرکرد، "ڕەنگی زەرد، لاڵ ببوو، چاوەکانی کرابوونەوە و هەر وەستابوو و جووڵەی نەدەکرد، گوتم: بۆ لە ناکاو هاتییە ژوورەوە؟!!.

گوتی:بەزەییم پێتدا هاتەوە، ئەمەی گوت و بە خێرایی چووە دەرەوە.ئەمجارەیان دەرگاکەم داخست و کراسەکەم داکەنەوە, زۆر جوانبووم،تفم لە جوانییەکەم دەکرد،کە بوەتە چ بەڵایێ لە ژیانمدا، بە تەواوی سەرنجی خۆمدا،بریندار نەبووم،بەڵام چەن شوێنێکم ڕووشابوو. لە کاتی نانخواردنی نیوەڕۆدا بوو،محەمەد هەر سەیری دەکردم، سەیرکردنێکی خۆشەویستیی و عیشقبازی،ترسام دایك و باوکی بزانن حەزم لێدەکا,دەرم بکەن،یا وەك ئاژەڵ بمفرۆشنەوە بە ماڵێکی دی.ئەو ڕۆژە بە نیازی چوونە بازاڕبوون،بەڵام محەمەد خۆی کرد بە نەخۆش و چووە ژوورەکەی،دایکی گوتی: ئاگاداری

محەمەد بە، ئێمە بۆ بازاڕ دەچین.گوتم: بە سەرچاو.بەڵام زۆر دەترسام، بە هۆی بینینی منەوە (بێ بەرگ) بە ڕاستی تووشی نەخۆشی بووبێ. ئەوان ڕۆیشتن و دەرگام داخست، کارەکانم کۆتایی پێهێنا و چوومەوە ژوورەکەی خۆم، دەسمکرد بە خوێندنەوەی یادەوەرییەکانم، لە هێندێ یادەوەرییدا چاوەکانم پڕ لە فرمێسك دەبوون و دڵۆپ دڵۆپ دەکەوتنە سەر لاپەڕەکان.لەو کاتەدا (محەمەد) بانگیکردم گوتی: وەرە چام بۆ بکە سەرم ئازاری هەیە.چاوم سڕییەوە ،دەفتەرەکانم هەڵگرت و چووم بۆ چێشتخانەکە، ئەویش دانیشتبوو لە سەر کورسییەك،کە دەیبینیم،ڕەنگی تێکدەچوو!!.

گوتم: چۆنی محەمەد؟

گوتی:باشم، بەڵام سەرم ئازاری زۆرە، چایەکم بۆ بکە. هەستم لای بوو،جاروبار زۆر بە تاسەوە تەماشایدەکردم،ڕەنگی چەن جارێ دەگۆڕا و ئارەقیدەکرد،کە چایەکەم بۆ برد، دەیویست قسە بکا،بەڵام نەیدەتوانی،لاڵ ببوو و ووشەی لە زار بۆ دەرنەدەهات، چایەکەم بۆ دانا و گوتم: گەر ئیشت نییە دەچم بۆ ژوورەکەم پشوویێ دەدەم، بە سەیرکردنێکی تامەزرۆی هەرزەکارییەوە چاوەکانی پڕ لە ئاو ببوون، نێوچەوانی لەبەر ئارەق کردنەوە بریقەی دەهات. بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی: بڕۆ !.

ڕاکشابووم لە سەر قەرەوێڵەکەم، خەیاڵ بردبوومیەوە، هات و لەبەردەم دەرگای ژوورەکەم وەستا، "ڕەنگی زەرد ببوو، قسەی نەدەکرد و دەمی تەتەڵەی دەکرد، دەسی دەلەرزی"، منیش هەستام، ئەویش کەمێ هاتە پێشەوە، لێی نزیکبوومەوە، گوتم: محەمەد، دەسکاری کارەبات نەکردووە؟!!

گوتی: نا.

گوتم: ئەی بۆ وا تێکچووی؟!!

بە چەن وشەیەکی پچڕ پچڕ گوتی: من تۆم خۆشدەوێ، لەو ڕۆژەوەی بێ بەرگ تۆم بینیوە، خەوم نییە.

گوتم: محەمەدگیان، من خوشکی تۆم، چۆن دەبێ برا حەز لە خوشکی خۆی بکا؟!هێدی هێدی لێم نزیکدەبوەوە، گوێی لە قسەکانم نەدەبوو، باوەشی لێدام، منیش وەك برایێ باوەشم لێدا تا کەمێ دڵی هێوربێتەوە، بەڵام ئەو دەس و دەمی دەگێڕا و دەیویست ڕابواردن بە لەشم بکا، زۆر بە هێزبوو، وەك شێت وابوو، دوورمخستەوە،بەڵام ئەو لاڵ ببوو و بە دەستە لەرزۆکەکەی هەر دەسی دەهێنا.ژوورەکەم جێهێشت و چووم بۆ چێشتخانەکە، لە دوامەوە هات و دەپاڕایەوە تا بێڵم ڕابواردن بکا، هەڕەشەم لێکرد گوتم: بە ساهیرە و ماهیرە دەڵێم، بابزانن ئەو برا چاك و دڵسۆزەیان دەیەوێ زوڵمم لێبکا. چاوەکانی پڕ فرمێسك بوون، گوتی: بە دەس خۆم نییە، خۆشم دەوێی، ئەشقت بووم!!.

گوتم: تۆ منت خۆشدەوێ، دەبێ زوڵم بکەی و پێم ڕابوێری؟!

لەو کاتە زەنگی دەرگا لێدرا، بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی: نەکەی لای ساهیرە و ماهیرە باسی بکەی.

گوتم: باشە بە سەرچاو. ئەو ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی، منیش دەرگام لێکردنەوە. محەمەد ڕۆژانە بە ترسەوە تەماشای دەکردم، لە هەڕەشەکەم دەترسا،چونکە زۆر ساهیرە و ماهیرەی خۆشدەویست، هەر کاتێکیش بانگم بکردایە، پێم دەگوت:محەمەدی برام، تەنیا بۆ ئەوەی منی لە بیر بچێ،جاروبار بەزەییم پێدەهاتەوە کە هەرزەکارێکە و ئاشقی من بووە، زۆر پەشیمان بووم کاتی داکەندنی جلەکان دەرگام دانەخستبوو،چونکە پێشتر، محەمەد بە ڕاستی وەك خوشکێ تەماشای دەکردم. شەوێکیان لە نیوە شەودا بوو، لە پێش دەرگاکە بوو بە دەنگەدەنگ، چەقۆکەم لە ژێر سەرینەکە دەرهێنا،چوومە نزیك دەرگاکە و گوێم هەڵخست، کوڕ و باوك بوون.عەبە دەیگوت بەم نیوە شەوە چییدەکەی لای ئەم دەرگایە؟!!کوڕەکەی گوتی: ئەی تۆ چیی دەکەی؟!! هەر ئێستە دەچم بە دایکم دەڵێم، کە پێوەندییێ نهێنییت لەگەڵ نەسرین هەیە.

باوکی گوتی:جارێکی دی لای ئەم دەرگایە نەتبینم.

ئەویش گوتی: منیش نامەوێ لای ئەم دەرگایە بتبینم و خیانەت لە دایکم بکەی. ئەو شەڕەیان بۆ من زۆر باشبوو ، چونکە لەو شەوەوە کەسیان لە ترسی ئەوی دیکەیان نەیاندەوێرا بێن،

هیچ کەسیان ماڵیان بۆ ئەویدی چۆڵ نەدەکرد، تەنانەت لە ترسی یەکدی زۆر سەیریان نەدەکردم،قسەیان لەگەڵمدا نەدەکرد.بەو بەسەرهاتەیان ڕزگاربووم لە هەردووکیان.

(١٦)

ئەوشەوە زۆر بێزاربووم، دەسم کرد بە نوسینی یادەوەرییەکانم، لە دەفتەری چوارەمی یادەوەرییەکانمدا بووم،لە دوا لاپەڕەی هەردەفتەرێ ، وێنەیەکم کێشابوو، لە دەفتەری یەکمدا پەڵە هەورێکی ڕەش ،لە دووەم وێنەی قەلەڕەشێ، لە سێیەم بایەقوشێ. بیرمکردەوە لە چوارەمدا وێنەی چیبکەم،هەناسەیەکی زۆر قووڵم هەڵکێشا, گوندەکەمانم بیر هاتەوە،دەسمکرد بە وێنەکردنی جوانترین وەرز،شاخوداخی پشت گوندەکەمانم دروسکرد و ئەو پێدەشتەم بە گوڵە نێرگز و گوڵاڵە سووره پڕکردەوە،وامدەزانی لە نێو گوندەکەمانم، هێند دڵم بەو وێنەیە خۆشبوو، زۆر گریانمی، لەگەڵ وێنەکێشانی هەر گوڵێ، فرمێسك دەبووە ئاورینگ و دەتکانە سەر پەڕەی گوڵەکان، وێنەی خۆرێ زۆر جوانم لەو دیوی شاخەوە کێشا، بە تیشکەکەی گوندی ڕووناککردبوەوە، خەیاڵ بردبوومیەوە،وامدەزانی لە گوندم ولە خەونێکی ترسناك ڕاچڵەکیوم و خەونەکە بۆ دایکم دەگێڕمەوە،بەڵام کە خۆم بینییەوە لە سەر قەرەوێڵەم، لە ژوورێکی بەندێتی تاکە کەسیدام، سەرم بۆ ئاسمان بەرزکردەوە، دەسەکانم بڵندکرد و لە خوا دەپاڕامەوە،"

خوا گیان، تۆ بڵێی ڕۆژێ بێ و بچمەوە بۆ گوندەکەمان ، لەگەڵ دایکوباوکم و ڕێباز ژیان دەس پێبکەینەوە،خوا گیان سکاڵایەکە و بە تۆی دەڵێم، تۆ خۆت دادوەری هەموو جیهانی، دەبێ کەی دادگایی ئەم مرۆڤە ترسناك و خراپانە بکەی، گەلێ زوڵمم لێکراوە کەس نەزانێ تۆ دەیزانی،تۆش خاوەن بەزەیی زەوی و ئاسمانی، دەبا بەس بێ! خوا گیان بەس!!" سەرم داخست ،چەن دڵۆپ لە ئەسرینم ڕشت،دەفتەری یادەوەرییەکانم لە شوێنی خۆی دانایەوە چوومەوە سەر قەرەوێڵەکەم،ئەو شەوە بە خەیاڵی گوندەکەمانەوە خەو بردیمیەوە.

(١٧)

ئەو بەیانییە، محمد ودایك و باوكی لە خەو زوو هەستان، دڵیان زۆر تەنگبوو، سەرمسوڕمابوو،لە دڵی خۆمدا دەمگوت: دەبێ محمد نهێنییەكەی نەدركانبێ!!.كە لەگەڵ یەكدی گفتوگۆیان دەكرد , هەستم لای ووشە بە ووشەیان بوو، تا شتێ بزانم، دەمویست پرسیار بكەم، بەڵام لە وەڵامەكەی دەترسام، نەوەك پێوەندیی بە منەوە بێ،هەرسێكیان بە نیازی دەرەوە بوون،زۆریش بە پەلە بوون، لە كاتی ڕۆیشتنیان، چووم بە ڕێیان بكەم، پێشئەوەی عایشە سواری قەمەرەكە بێ،گوتم: عایشە بۆ دڵتان تەنگە, چیی بووە ؟!! بە تووڕەییەوە گوتی: لە سایەی سەری ئێوەوە، ئێوەی عێراقیی،چیی نەبووە!!.دەرگای قەمەرەكەی بە توندیی پێوەدا و بە چەنەگەی هێمای بۆ عەبدوڵڵا كرد كە بڕوا.زۆر ترسام، گوتم: محمد نهێنییەكەی باسكردووە، دڵنیام چوون تا بە ماڵێكی دیم بفرۆشنەوە!!

بە دڵێكی تەنگەوە گەڕامەوە چێشتخانەكە، هەردوو كچەكە دانیشتبوون، لە چاوەڕوانیی بوون تا خواردنیان بۆ ئامادە بكەم. ساهیرە گوتی: نەسرین بۆ وا بێ هێزی دەڵێی نەخۆشی؟.

گوتم: کەمێ سەرم ئازاری هەیە.

ماهیرە گوتی: خۆ دایکم قسەی پێنەگوتووی.

گوتم: قسەش بکا مافی خۆیەتی.

گوتی: بۆ مافی خۆیەتی، تۆ ئەم هەموو خزمەتەمان دەکەی، زۆر پێمانەوە ماندووی، هێشتا دەڵێی ماق خۆیەتی؟.

ساهیرە گوتی: توخوا پێمان بڵێ چیی بووە؟!

گوتم: بەیانی زوو( محمد وباوك و دایکتان ) زۆر دڵیان تەنگبوو، کە بە دایکتانم گوت چییبووە،گوتی:لە سایەی سەری ئێوەوە چیی نەبووە.

ساهیرە گوتی:تۆ تاوانت چییە، سوپای سەدام هەڕەشەی گرتنی وولاتەکەمان دەکا.زۆر گەشبوومەوە،دڵم زۆر خۆشبوو، بەلام لەبەر کچەکان دەرمنەدەبڕی کە دڵم زۆرخۆشە.

گوتم. چییبووە ئاگادار نیم؟.

ماهیرە گوتی:ئەمشەو سوپای سەدامی پێشاندا لە سنووری وولاتەکەمانە و بە نیازە پەلامارمانبدا، پاش نانخواردن دەچین سەیری تێلێفزیۆن دەکەین تا سوپاکە ببینی.

هەر بە پەلە خواردنم ئامادەکرد، بۆ یەکەمجاربوو لەگەڵیان دانیشم و نانبخۆم،کارەکانمان بە پەلە تەواوکرد،چووین بۆ ژوورەکەم، تێلێفزیۆنمان پێکرد، سوپای عێراقم بینی بە کۆپتەر، تانك، زرێپۆش و فڕۆکە لە سنووربوون، دڵم کرایەوە،بەلام لە دڵی

خۆمدا گوتم: گەر ئەم سوپایە بێن، خەڵکی ئێرە ئەنفالدەکەن، منیش بۆ دووەمجار ئەنفال دەکرێمەوە، بەزەییم بە هەردوو کچەکە دەهات، لەم تەمەنە بەردەسی ڕژێم بکەون ئابڕوویان دەتکێنن، چونکە زۆر بێئابڕوون، بەلام زۆر حەزمدەکرد عایشە، عەبدوڵلا و محمد، بکەونە ژێر دەسی سوپاکە وتا بە چاوی خۆم ببینم چۆن دەناڵێنن.

لە دەرگا درا، کچەکان بە پەلە بۆ ژووری خۆیان چوونەوە، منیش خۆم گەیاندە دەرگاکە و کردمەوە، هاتنە ژوورەوە بەلام نەچوونە ژوورەکانی خۆیان، لە چێشتخانەکە دانیشتن. گوتیان: چایێ بکە.

عەبدوڵلا: نەسرین، سەدام دەیەوێ وولاتمان داگیربکا،دەبێ بیکا؟!!

گوتم: دەیکا، چونکە زۆر دڕندەیە، ئێمە گەلی عێراقیی بووین، بەلام چونکە کوردبووین، بە ژن، منداڵ، پیر و لاوەوە، ئەنفالی کردین و ئێمەی وەك جارییە بە ئێوە فرۆشت. عایشە زۆر ترسا، توورە بوو لە عبدوڵلا،گوتی: بڕۆ واستەیێ بدۆزەرەوە، بۆ ئەوەی کاتی ڕۆیشتنمان بۆ هەندەران پێشبخات، بڕۆ بڵێ هەفتەیێ زۆرە، ئەوەك سەدام پەلامارمانبدا و نەتوانین ڕابکەین، پتر توورەبوو گوتی: بۆ ئەوەندە بێدەسەلاتیی،خزمان بەیانی دەڕۆن، هەر ئێمە

دەمێنین، ئەویش چایەکەی خواردەوە و بە خێرایی لەگەڵ محمد ڕۆیشتن.

زۆر پەشیمانبووم لە وەڵامەکەم ،چونکە زیاتر ترسان و بووە هاندەری زوو قوتاربن و بۆ هەندەران بچن.

پاش چەن کاژێری هاتنەوە, ئێمەش هەر لە چێشتخانەکە دانیشتبووین عەبدوڵلا گوتی: چوومە لای ناسیاوێ ، سێ ڕۆژی پێشخست ، واتا ئێمە چوار ڕۆژی دیکە دەڕۆین،بەلآم دەزانن خەڵکێکی زۆر ڕۆیشتوون بۆ هەندەران!!بەم هەواڵە عایشە هێزی ئەژنۆی شکا، زۆر هەستمڕاگرت،ئایا من دەبەن بۆ هەندەران یا نا، بەلآم بە هیچ شێوەیێ باسی منیان نەدەکرد.شەوێ لە ژوورەکەمدا سەیری تێلێفزیۆنم دەکرد، چاوەڕوانیی ئەوەبووم ساتێ زووتر سوپاکەی ڕژێم پەلاماری کوێت بدا،تا ئەمانە ڕزگار نەبن.

لە دەرگای ژوورەکەم درا، هێشتا زووبوو، کە دەرگاکەم کردەوە عایشە و مێردەکەی بوون ،بۆ یەکەمجار بوو عایشە بێتە ژوورەکەم، پریاسکەیەکیان پێبوو،لە سەر قەرەوێڵەکە دانیشتن،عایشە زەردەخەنەیەکی بۆ کردم و بە شەرمەزارییەوە گوتی: هەموو بڕوایەکم بە تۆ هەیە، ئێمە چوار ڕۆژمان ماوە لێرە و دەچین بۆ هەندەران،تا یەك مانگ نایەینەوە،دەبێ ئاگاداری ماڵ بی، هەرکەسێ هات،بڵێ چوونە بۆ هەندەران، پریاسکەیێ پڕ لە پارەی

بۆ هێنابووم ،گوتی: نزیکی ساڵ و نیوێکە تۆ خزمەتمان دەکەی، ئەم پارەیە لە بری ماندوو بوونتە.

گوتم: چییدەڵێن بە سەرچاو.

گوتی: سوپاستدەکەین،زانیم جێی دڵنیایی ئێمەی. هەستان و چوون بۆ ژووری خۆیان.دڵیان زۆر خۆشبووکە ڕزگاردەبن، منیش دڵتەنگبووم چونکە ئەوەی لە خەیاڵمدایە نایەتەدی،بۆ دووەمجار ئەنفالدەکرێمەوە.

(١٨)

گەیشتینە سێیەم ڕۆژ ،بۆ بەیانی نۆرەی ڕۆشتنیان بوو،شەوێ خۆیان ئامادە دەکرد،تا شەوێ درەنگ خۆیان خەریککردبوو، منیشیان زۆر ماندوودەکرد،چونکە داواکاریان زۆربوو،بۆ یەکەمجار بوو هەردوو کچەکە بە شەو بۆ سەردانیم بێن.

ساهیرە گوتی: حەزمان دەکرد تۆش لەگەڵمان بێیت.

گوتم: منیش حەزمدەکرد،بەڵام چیبکەم،باوك و دایکتان ناهێڵن و خانووەکەیان بە من سپاردووە.لەو کاتەدا دایکیان هات گوتی: بە پەلە وەرن بۆ ژوورەکانتان،زوو بنوون،چونکە بەیانی زۆر زوو دەبێ بگەینە فڕۆکەخانە،بە منیشی گوت:بەیانی زوو هەڵمانسێنە لە بیرت نەچێ،ئینشەڵلا هەر هاتینەوە لە هەندەران،دیارییەکی زۆر جوانت بۆ دێنم، شەو شادیان لێکردم و ڕۆیشتن.

خەمێکی زۆر ڕووی تێکردم،نەمدەزانی چیبکەم، تەماشای تێلێفزیۆنەکەم دەکرد،تفم لە سوپاکە دەکرد بۆ هێرش ناهێنن. بە قینەوە کوژانمەوە،چوومە سەر قەرەوێڵەکەم گوتم: با بنووم، چونکە بەیانی زوو دەبێ هەستم و بە ڕێیان بکەم، ئەوان ڕزگاردەبن

منیش دووبارە ئەنفال دەکرێمەوە،بەو خەمەوە لە سەر قەرەوێڵەکە ڕاکشام و نووستم.

لەبەر توندیی و بە هێزیی لێدانی دەرگاکە،ڕاچڵەکیم،زۆر ترسام،سەیری کاژێرمکرد،لە سێی شەودا بوو،بە ئاسپایی و بە ساردییەکەوە چووم دەرگایان لێبکەمەوە،تا دوا ماڵاواییان لێبکەم و بچن بۆ هەندەران،دەرگامکردەوە،ترسێکی سامناك ڕووی داپۆشیبوون,قسەیان بۆ نەدەکرا ،وەك لاڵیان لێهاتبوو، ڕستەیەکی جوانیان بۆ دروستنەدەبوو تا تێبگەم.

گوتم: عایشە چییبووە، تۆ وەڵامم بدەرەوە؟!!.

گوتی: گوێت لە گرمەی ئەو تۆپانە نییە، ئەی نازانی کارەبا بڕاوە؟!!کە هەستم ڕاگرت،ڕاستیدەکرد،زۆر دڵخۆشبووم،هەستیان بە دڵخۆشیەکەم کرد.عەبە وەستابوو و ڕەنگی مردووی لێنیشتبوو.

عایشە گوتی: دەتوانی بچیی بۆ سەربان و بزانی چییبووە؟!!

سینگم دەرپەڕان،بە بزە وگاڵتە پێکردنەوە، سەیرێکی (عەبە)م کردوگوتم:بە سەرچاو هەرئێستە.بە پەلە هەنگاوی خۆشیم دەنا، سەرکەوتم بۆ دووەمین نهۆمی سەربانە پانوبەرینەکەیان، لە هەر چوارلای سەربانەکەوە تەماشامدەکرد،فڕۆکە و کۆپتەری ڕژێمم بینی بە ئاسمانی کوێتەوە،دەبابە و زرێپۆش لە سەر شەقامەکان هامووشۆیاندەکرد،چەکدارانی کوێتیان سەرکوتدەکرد،دڵم گەشبووەوە،حەزمدەکرد هەر بە زوویی ئەم هەواڵە بگەیەنمە عەبە و

عایشە،بۆ ئەوەی بیانتۆقێنم.چوومە خوارەوە، هەموو وەستابوون،لە دوا پایەی پەیژەکە، لەو شوێنەی عایشە فڕێی دامە خوارەوە و لەشی ڕووشانم،گوتم: سوپای عێراقیی کوێتی گرتووە،بە ئارەزووی خۆی بە ئاسمان و زەوی کوێتدا دەسوڕێنەوە،مۆڵگەکانی کوێتی بەر ساروخ و تۆپ و هاوەن داوە.

عایشە گوتی: ئێمە دەتوانین بچین بۆ هەندەران؟!!

گوتم:تازە ناتوانن، گەر دوێنێ بوایە دەتانتوانی.

ڕوویکردە مێردی ،هەزار جنێوی پێدا و ڕیسوایکرد،زیاتر دڵخۆشیکردم، دەمی تەتەڵەیدەکرد،نەیدەزانی چیبڵێ،کەمێ بیری کردەوە وگوتی:با بچینە ژێر زەمینەکەوە.

عایشە گوتی:نەسرین،جێوبان بۆ ژێر زەمینەکە ببە و خواردنمان هەر بۆ ئەوێ بۆ بێنە،هەرکەس هات بڵێ چوونە بۆ هەندەران.

تەنیا بەزەییم بە هەردوو کچەکە دەهات ،دەسم نایە سەریان گوتم: مەترسن هیچ نابێ. هەر پێنجیان چوونە ژێرزەمینەکەوە، ژێرزەمین بووە هەندەرانیان،منیش چوومەوە ژوورەکەی خۆم، گوتم:" ڕۆژان ڕۆژی لە دوایە"دەبێ ئەمجارەیان تۆڵەی خۆم بکەمەوە، چالاکیێ دیکە بۆ خەباتی (هێزی گیانیی تۆڵەی کچان ) تۆماربکەم.

تا کاتی بەیانی،چەنجارێ چوومەوە سەربان و هەواڵی ناخۆشم بۆ دەبردن، ژەمی بەیانیم بۆ بردن،لە ترسان خواردنیان بۆ

نــەدەخورا، لەگــەڵ گرمــە و دەنگــی هەرتەقــەیێ دڵــم پــتر خۆشـدەبوو،لای مـن دەنگـی تەقـەی خۆشـیی بـوو. لـە دووەمـین ڕۆژ،بـەیانی زوو بـۆ سـەربان چـووم،کە ڕوانـیم، چـەکداری ڕژێـم ماڵــەکان دەپــشکنن،منیش ترســم لێنیــشت،بە پەلــە هاتمــە خوارەوە،چـوومە ژێرزەمینەکـە و هەواڵەکـەم پێراگەیانـدن، هێـزی ئەژنۆیان شکا،عایشە دەگریا،عەبدوڵلا و محمد ڕەنگـی مردوویـان لێنیشتبوو،ساهیرە و ماهیرە لـەوان ئازاتربوون،بە هێمنی وبێدەنگ چووبونە نێو دەریای خەیاڵێکی قووڵەوە،بەزەییم بە هەر دووکچەکە دەهات،لێیـان نزیککەوتمـەوە، دەسـم بـە سـەریاندا دەهێنـا و دڵـم هێوردەکردنەوە.

چوومەوە بۆ چێشتخانەکە، لە سەر کورسیێ دانیشتم و سـەیری دەرگای حەوشەمدەکرد،لە چاوەڕوانیی لێدانی دەرگاکە بووم.

(١٩)

پاش کاژێرێ، هەر بە قۆناغە تفەنگ و شەق دەرگای حەوشەیان کردەوە و هاتنە ژوورەوە،جامی قەمەرەکەیان شکان،منیش هەستام،زۆر ترسام ئەمانیش زوڵمم لێبکەن و بۆ دووەمجار ئەنفال بکرێمەوە،چونکە سەربازەکان زۆر قین لە دڵ دیاربوون.

کە منیان بینی،سەربازێکیان (بە زمانی کوردیی بە هاوڕێکەی گوت: پێی بڵێ تۆ بۆ بە تەنیای،ماڵەوەتان لە کوێن؟) موچڕکێ لە نوکی پێمەوە هات و لە تەوقی سەرمەوە دەرچوو، لاڵیکردم، نەمدەزانی لە خۆشیاندا چیبکەم و چیبڵێم،بۆمدەرکەوت هەر چوار سەربازەکە کوردن، بە زمانێکی عارەبیی شکاو و دوکەڵاوی قسەی لەگەڵ دەکردم، منیش پەلامارمدا و ماچم کرد،گوتم: قوربانتانبم ئێوە کوردن؟!!ئێوە برای منن. زۆر سەریان سوڕمابوو گوتیان: تۆ لێرە چییدەکەی ،ماڵتان لێرەیە؟!!

گوتم:جارێ پرسیار مەکەن ،وەرن دانیشن،با چایەکتان بدەمێ وئەوسا باسی خۆمتان بۆ دەکەم.لە کاتی چا خواردنەوە بوو، یەکیان گوتی: فەرموو باسی خۆت بکە.

گـوتم:مـن کـچە کـوردێکی ئـەنفالکراوم،ڕژێم بـەم عارەبانـەی فرۆشتووین،من ئێستە لەم ماڵەدا کۆیلەم،جاریەم.

حەپەسابوون،وازیان لە چا خواردنەوە هێنا.یەکێ دیکە گوتی: چەن کەس دەبوون ؟!!.

گوتم:یەکەمجار حەفتا کچ بووین،بەڵام نازانم دوای ئێمە چەندی دیکەیان فرۆشتووە.سەربازی سێیەم: خاوەن ماڵەکە لە کوێن؟

گـوتم:لـە ژێـرزەمین خۆیـان حەشارداوە،بە منیـان گـوت:پاسـەوان بە،گـەر یـەکێ هات،ئاشـکرامان مەکـە و بڵـێ چـوونە بۆ هەنـدەران، پیاوەکـە نـاوی (عەبـدوڵڵا) یــە،زۆر زوڵمـی لێکردووم،ئـابڕووی بردووم،تەنانــەت کوڕەکەیـشی دەیویـست ئـابڕووم بـەرێ،منیش چاوەڕوانیی ڕۆژێ وا بووم تا تۆڵە بکەمەوە!!.

گوتیـان: شـوێنەکەمان پێبڵـێ، هـەر ئێـستە تۆڵـەت دەکەینـەوە. چـاویانکرابوەوە،دەیانگوت: ئـەو ترسـنۆکانە بوونـە ئـەو پیـاوەی شەرەف وئابڕووی ئێمە بەرن.

دڵـم زۆر خۆشبوو کـە گوتیـان (شـەرەفی ئێمـە)،هەسـتم دەکـرد بـە ڕاستی کوردی دڵسۆزن،بران و پشتی منن، هـەر یەکـەیان (ڕێبـاز)ێ بـوو، هــەر یەکــەیان پێــشمەرگەیێ بــوون.بــە خێرایــی بــەرەو ژێرزەمینەکـە هـەنگاوم دەنـا، هــەر چـواریان بـە دوومکـەوتبوون دەرگـای ژێـرزەمینم کردەوە،بێپرسـینەوە بـە قۆنـاغە تفەنگ،شـەق و زللە،کەوتنـە لێـدانی (عەبـە) و (حەمـە).(عایـشە) ئەژنۆی شـکابوو و

نەیدەتوانی هەستێ،چەنەگەی دەلەرزی و لێدانی دەنگی دانەکانی دەهات،هەر دوو کچەکە لە سوچێکی ژێرزەمینەکە خۆیان ئالآنبووە یەکدی و دەگریان ، دەسە ناسکەکانیان دەلەرزی.

(عەبە و حەمە) هاواریان دەکرد،پەلاماری پێی سەربازەکانیان دەدا ماچی بکەن،تا وازیان لێبێنن.

یەکیان گوتی:ئابڕووی ئەم کچە کوردەتان بردووە، ئێوەی بێغیرەت؟! ئەمە شەرەفی ئێمەیە، ئێمە کوردین، دەسیان بە لێدانیان دەکردەوە. بانگیان دەکردم،(نەسرین) پێیان بلێ وازمان لێبێنن.

یەکێ لە سەربازەکان زۆر تووڕەبوو،بە(عەبە) ی گوت: هەر ئێستە لەبەر چاوت ئابڕووی هەر دوو کچەکە و ژنەکەت دەبەم،بابزانی ئابڕوو چییە!!.

پەلاماری کچەکانیدا، هاواریاندەکرد.منیش بە پەلە ڕامکرد، گوتم:نەکەی،ئەم دوو کچە زۆر بەزەییان پێمدەهاتەوە، گەر ئێمەش ناپاکی بەرانبەر ئابڕووی خەڵکی بکەین، لەگەڵ ئەوان جیاوازییمان چییە؟

سەربازێ گوتی:ڕاستدەکا،واز لە ئابڕوو بێنن،با ئەم دوو سەگبابە بکوژین.

گوتم: نەکەن ئێوە بیانکوژن، بە گۆڕی شەهیدان،دەبێ من بە دەسی خۆم بیانکوژم،لە ئێوە باشتر دەتوانم چەك بەکاربێنم، (ڕێبازی برام و پێشمەرگە) فێریان کردووین.

سەربازێ چەکەکەی دایە دەسم،گوتی:فەرموو بیانکوژە.چەکم ڕاکێشا،ڕووی لوولەی تفەنگم لە (عەبە) کرد،بە خشکە خشك، دەیویست بگاتە پێی سەربازەکان وماچی بکا و بپاڕێتەوە،نیشانم لە سەر دڵی گرت ویەك فیشەکم لێدا،نیشانێ دیکەم لە سەری گرت و مێشکیم پڕژان.عایشە کەوتبوو،چاوەکانی کرابوونەوە،ڕووی تفەنگم لە (حەمە) کرد،هاواریانکرد،عایشە بووراییەوە،ساهیرە خۆی پێگەیاندم، چاوەکانی بە فرمێسکی نائومێدیی سووربببوون، زۆر پاڕایەوە کە براکەی نەکوژم،دەسم ساردبووەوە،گوتم: نەکەن بڵێن زوڵممان لێدەکا،(عەبدوڵڵا) ی باوکتان، شەوانە دەهات بۆ گیانم دەیویست ئابڕووم بەرێ ،(حەمە) هەر بەوشێوەیە، بەڵام لە پێناو تۆو خوشکەکەت،کوشتنی (باوکتان)م بەسە. سەربازەکان بێدەنگ ببوون،زۆر بەزەییان پێمدەهاتەوە، گوتیان: چیدی دەڵێی بە سەرچاو،گەر تۆ لەبەر خوشکەکانی دەست لە(حەمە) ناچێ،ئێمە دەیکوژین.گوتم: نەخێر، زۆر سوپاستاندەکەم ،نامەوێ بکوژرێ، چەکەکەم دایەوە دەس سەربازەکە و دڵم ئۆخەی کرد کە (عەبە)م کوشت،(محەمەد)م بەخشییە هەر دوو خوشکەکەی.سەربازەکان گوتیان:با بڕۆین، تۆش لەگەڵمان وەرە، چونکە ناتوانی لەم ماڵە بمێنی.

بۆ دوا جار،تەماشای (ساهیرە و ماهیرە)م کرد، چاوەکانیان لەبەر گریان سووربببوو، فرمێسك بە ڕوومەتیانەوە هەر مابوو، گوتم:

لەبەر هەردووکتان نەبوایە، (دایك و براکەتان)یشم دەکوشت، بەڵام خوا قوربانیی ئێوەیان بکا. تەماشایان دەکردم و هیچ قسەیان نەدەکرد، حەپەسابوون،چونکە دیمەنی وا دڵتەزێنیان نەبینیبوو.

چاوەکانم پڕ لە ئەشکبوون،زۆر بەزەییم بە کچەکان دەهاتەوە،ڕووم وەرگێڕا،لەگەڵ سەربازەکان چووینە دەرەوەی ژێر زەمینەکە.

چوومە ژوورەکەم، پارەکان و هەر چوار دەفتەری یادەوەرییەکانم هەڵگرت و چووینە دەرەوەی ماڵەکە، لە کۆیلەیەتیی ئەو ماڵە ڕزگاربووم.

(٢٠)

هەر بە کراسی جەلەبی عارەبییەوە، شان بە شانی سەربازەکان دەڕۆیشتم، هەموو سەربازەکانی سەر شەقام سەیریان دەکردم، منیش سینگم دەرپەڕانبوو، شانازیم دەکرد کە تۆڵەی خۆم کردبوەوەو چوار کوردیی دڵسۆزیش لەگەڵمدا بوون، بە ڕاستی براپشتم بوون .لە دوورەوە پیاوێکی بە تەمەن دیاربوو ،جلێکی کوردیی لەبەردا بوو،مژی لە جگەرەکەیدەدا و سەیری ئەملاوئەولای دەکرد وچاوی لە دوای یەکێ دەگێڕا.زۆر گەشبوومەوە، بە پەلە بۆ لای ڕۆیشتم یەکسەر دەسەکانیم ماچکرد، گوتم:مامە گیان،تۆ چییدەکەی لێرە؟! توخوا بمکە بە کچی خۆت.

سەریسوڕمابوو،کچێ کوردوچوار سەربازی کورد دەورمان دابوو.

سەربازێ :مامە گیان چییدەکەی و بە دوای چیدا وێڵی؟

گوتی:کوڕەکانم، ئاگری جەرگ هەڵی گرتووم،کوڕێکی تاقانەم سەربازە و لێرەیە،هاتووم لەگەڵ خۆم بیبەمەوە.

یەکیان گوتی: ناوی چییە و ناونیشانیم بدەری؟

گوتی: ناوی ئەحمەدە، بەڵام ناونیشانی نازانم.

سـەربازەکە گـوتی:مامـە گیان،ئـەوەی ناونیـشان دەزانـێ نایدۆزێتەوە، تۆ بێناونیشان چۆن دەیدۆزیتەوە؟!!خۆ ئێرە گوندێ نییـە و پرسـیار بکـەی لـە خـەڵکی ئاوایی،مامـە گیـان ئێـرە دەوڵەتێکە!!.

یەکێ دیکە گوتی: مامە گیان، یاخوا بە خێربێی، بە ڕاستی گەر دەتەوێ کوڕەکەت خوا بیپارێزێ و بە سەلامەتی بێتەوە، ئەوا ئەم خوشکەمان بگەیەنەوە کوردستان.

گـوتم: مامـەگیان توخـوا جێم مەهێڵـە، مـن لێـرە تـەنیا ئێـوە بـە کەسی خۆم دەزانم.

گوتی: کچەکەم، تۆ لێرە چیی دەکەی؟!

نەیانهێشت وەڵامبدەمەوە.

سـەربازێ گـوتی:مامـەگیان هـیچ پرسـیار مەکە،گـەر پێکـەوە بڕۆنـەوە، لـە ڕێ بـۆت دەردەکەوێ،ئـەم کـچە چ کـچە کـوردێکی قارەمانە!!.

مامــە پــیرە:بــە سەرچــاو دەیبەمــەوە، بــەڵام نــابێ کوڕەکــەم بدۆزمەوە؟!!

گوتیـان:مامــە گیــان دڵنیابــە نــاتوانی بیدۆزیتــەوە،تۆ خــوا خۆشیویـستووی کـە تووشـی ئێمـە بووی،گـەر بڕیـار بـدەی بـۆ کوردسـتان دەگەڕێیتـەوە، ئێـستە دەچـم هاوڕێیـەکی خـۆم دێـنم، شوفێری ئەمبولانسە و کوردە،دەتانگەیەنێتە نێو وڵاتـی خۆمـان.

جگەرەیەکی دی داگیرسان،مژێکی لێدا و گوتی: "ژێری پێنج کەس لە ژێری یەکیٚ باشترە" دەبڕۆ کوڕم بیهێنە تا لەگەڵ ئەم کچەم بگەڕێنینەوە. بە پەلە پەلاماری دەسیمدا،دیسان ماچم کرد، ئەمجارەیان زۆری پێناخۆشبوو،گوتی:(ئەستەغفیروڵڵا) کچم، من باوکی تۆم.گریام، گریانی خۆشی، گریانی خۆشیی ئازادبوون.

دووانیان بە پەلە ڕۆیشتن، گوتیان:کەستان لێرە نەڕۆن تا دێینەوە.

زۆر چاوەڕوانبووین،لە پڕ ئەمبولانسیٚ وەستا، شۆفێرەکە و دوو سەربازەکە بە پەلە دابەزین.

شوفێر:خۆتان وبە ختتان،ئەفسەرێکی بریندارم لەگەڵدایە و دەبیٚ بیگەیەنمە شارەکانی ئەودیو سنوور.

من و مامە پیرە لە دوای ئیسعافەکەوە سەرکەوتین،ماڵاوایییم لە سەربازەکان کرد،بەڵام بە داخەوە ناو و ناونیشانیانم وەرنەگرت، لە دڵمدا بووە گرێیەکی گەورە.

بە هۆی ئەفسەرەکەوە زۆر بە ئاسانی لە زاڵگەکان دەربازبووین، تا گەیشتینە یەکەمین شاری وولات.

لە نزیك ماڵێك وەستا، ئەفسەرەکە دابەزی و زۆر هەوڵیدا کە ئەو شەوە بمێنینەوە،بۆ بەیانی بڕۆینەوە بۆ شارەکانی خۆمان،بەڵام من زۆر پەلەم بوو، مامە پیرە لە من پەلە تر،زۆر سوپاسیمان کرد. شوفێرەکەش گەیاندینیە وێسگەی شەمەندۆفێری ئەو شارە، بلیتی بۆ برین تا پایتەخت.

(٢١)

لە فارگۆنی ژمارە دوو، لە دوو کورسی ژمارە (٤٩ ـ ٥٠) لە دوای دواوەی فارگۆنەکە دانیشتین، هەناسەیەکی ئازادییم هەڵکێشا، سەیرێکی مامە پیرەم کرد، تەواو ڕیشی سپیی ببوو، حەزمدەکرد سەرم بخەمە سەر سینگی پشوییْ بدەم، پشوویەکی کچ و باوکایەتیی.ئەویش تەماشایکردم،گوتی:کچەکەم کاتێکی زۆرمان بە دەسەوەیە،حەزدەکەم باسی خۆتم بۆ بکەی،چۆن گەیشتییە دەوڵەتی کوێت،چۆن بزانم تۆ کچە کوردێکی قارەمانیی؟!!.پاکەتێکی تازەی لە گیرفانی دەرهێنا وکردیەوە، جگەرەیەکی لێدەرهێنا،دایگیرسان و یەکدوو مژی لێدا ،ڕووی تێکردمەوە گوتی:فەرموو کچەکەم، باسم بۆ بکە، من باوکی تۆم، وەك (ڕێزان)ی کچمی.

گوتم: مامە گیان نازانم لە کوێوە دەسپێبکەم "ئێمە خەڵکی ئەو گوندانەین کە بەر شالاوی ئەنفال کەوتین،لە بەهاری ساڵی ١٩٨٨، کارەساتی ئەنفال ناوچەکانی ئێمەیشی گرتەوە، ئەنفالکراین.

سات بە سات، قۆناغ بە قۆناغ، بەسەرهات لە دوای بەسەرهات، بۆ مامە پیرەم باسکرد.ئەویش جگەرەی بە جگەرە دادەگیرسان و

نەیدەکوژانــەوە، پــەکوو، پــەکوو و هەناســە هەڵکێــشانی، وای لێــدەکردم گــەرموگوڕتربم لــە ســەر گێڕانــەوەی ڕاســتییەکانی بەسەرهاتەکانم.کە سەیری مامە پیرەم کرد، فرمێسك لە چاوەکانیدا قەتیس مابوون،منیش گریانم دەهات، کە یەکێ هەیە و بەزەیی پێمدێتەوە ودڵسۆزمە.پاش ماوەیەکی دووورودرێژ لە باسەکەمدا، دوا ووتەم کە بینینی مامە پیرەبوو، فرمێسکەکانیم بینیی دڵۆپ دڵۆپ بە نێو ڕیشە سپییە پاکوبێگەردەکەی دەهاتە خوارێ، منیش خۆم بۆ ڕانەگیرا و گریام.پارچە پەڕۆیەکی لە باخەڵی دەرهێنا، ئەسرینی چاو و نێو ڕیشە سپییەکەی سڕییەوە.

گوتی: بە ڕاستی تۆ قارەمانی، خەباتگێڕی، خوای گەورەش لە سەر کوشتنی ئەو تاوانبار و بێئابڕوانە، لێت خۆشدەبێ.

دڵم دامرکایەوە کە بەسەرهاتەکانم بۆ کەسێکی دڵسۆز گێڕایەوە، گوتم: مامە گیان یەك داواکاریم هەیە.

گوتی: فەرموو کچەکەم، هەرچیی دەڵێی دەیکەمە سەرچاوانم.

گوتم: با ئەو بەسەرهاتانەم، نهێنیی بێ.

گوتی: دڵنیابە کچەکەم، نهێنییەکی پیرۆزە و لای هیچ کەس باس ناکرێ،بەڵام پێم بڵێ، تۆ کچی کێی؟.

گوتم: مامەگیان کچی (کاوێن)م، ئینشەڵڵا هەر کە گەیشتینەوە بە باوکمت دەناسێنم و چاکە و پیاوەتی تۆی بۆ باسدەکەم.

شێوەی گۆڕا، شێواو دەهاتە پێشچاو،ئاهێکی لە ناخی دڵییەوە هەڵکێشاوگوتی:کچەکەم،گەلەکەمان پشتاوپشت ئازار و ئەشکەنجە

و ئاوارەبوونی بۆ جێماوە،دەزانی ژمارەی ئەنفالكراو ١٨٢ هەزار كەسە و تا ئێستەش چارەنووسیان نادیارە. زانی هەواڵەكە كاری تێكردم، گوتی:كچەكەم تۆ قارەمانی،بە سەرهاتت زۆر بینیوە، بۆیە ئەم هەواڵەم پێگوتی،چونكە دەبێ بیزانی.

گوتم:كەواتە بچمەوە گوندەكەمان،دایكوباوكم و ڕێبازی برام نابینمەوە؟!!.

گوتی:كچەكەم،ماڵەكانیان هەموو تالانكردووە و گوندەكانیان بە شۆفەڵ ڕووخاندووە تەنیا شوێنەوارەكانیان ماوە.دڵنیابە ماڵەكەی من ماڵی تۆیە.

هێزم لێبڕا،ئاگام لە خۆم نەما،دەنگی هاواروگریانم سەرنشینەكانی ئاگاداركردەوە،بەڵام لای ئەوان ئاساییبوو،چونكە وایاندەزانی كەسێكمان لە شەڕەكەدا كارەساتی بەسەرهاتووە.زۆر ویستی دڵنەواییم بكا،بەڵام باوەشی گەرمیی دایك و باوك، گوندەكەمان كە هەمیشە خەونم پێوەی دەبینی و هیوایی بوون، كۆتایی هات.

زۆر ڕۆیشتین ،هەر دەگریام. ڕووم لە مامە پیرە كرد و گوتم: مامە گیان،(ڕێبان)ی برام نەكەوتە بەردەسی شاڵاوی سوپای ئەنفال، دەبێ ئەو لە كوێ بێ؟!!

زۆر بە ڕووخۆشییەوە و بۆ دڵنەوایی كردنم گوتی:خوا بكا (ئەحمەد) ی كوڕم بگەڕێتەوە،دڵنیابە (ڕێبان) ی برات هەر دەبینیەوە.گوتم: ئینشەڵڵا مامە گیان،بە سەلامەتی

دەگەڕێتەوە.کەمێ دڵم پشوویەکیدا،هیوای دۆزینەوەی (ڕێبان)ی برام،بوو بە پیرۆزترین ئاواتم.

سەیرێکی نێو فارگۆنەکەم کرد، سەرنشینەکان نووستبوون و ملیان خوار ببووەوە،گوتم:مامەگیان زۆر داوای لێبوردنت لێدەکەم، دڵم ئازاردای بە باسکردنی بەسەرهاتەکان،حەزدەکەم بنووی،کەمێ پشووبدەی،چونکە کاتەکە درەنگە.

گوتی:کچەکەم ئازارەکانی تۆ ئازاری منن،دەمەوێ تۆش بنووی، بەڵام پێشئەوەی بنووین،پێمبڵێ ئەو پرپاسکەیە چیی تێدایە؟

گوتم:مامە گیان،پارەی تێدایە،لەگەڵ چوار دەفتەرکە رۆژانە یادەوەرییەکانم تێیدا نووسیوەتەوە.

گوتی:باشە کچەکەم ئاگاداری پرپاسکەکەت بە، من دەنووم، بەڵام دەبێ تۆش بنووی و بیر لە هیچ نەکەیتەوە.

چاوم لێکنا، دەمویست بنووم و بە قسەی مامە پیرە بکەم، بەڵام سوودی نەبوو، نەمدەتوانی بیر نەکەمەوە، دیمەنی کوشتنی (عەبە) و پاڕانەوەی (ساهیرە و ماهیرە)،ببوونە ڤیلمێکی بێدەنگوترسناك، دۆزینەوەی (ڕێبان) ی برام ببووە هیوایێ،دیمەنی دایك و باوکم ببوونە دوو فریشتە و بە دوو زەردەخەنەی زۆر جوانەوە باوەشیان بۆ گرتبوومەوە،ببوونە تابلۆیەکی پیرۆز.بەو خەیاڵانەوە نەمتوانی بنووم.نزیکی بەری بەیان بوو، گەیشتینە پایتەخت، لە وێسگەکەدا دابەزین،لە چێشتخانەیەکی نزیك وێسگەکە نانی بەیانیمان خوارد و پاشان چووین بۆ گەراجی پاسەکانی شارەکانی کوردستان.

(٢٢)

ڕۆژ هەڵاتبوو،سواری پاس بووین و چووین بۆ شاری (هەولێر)، چونکە ماڵی مامەپیرە لەو شارە بوون.لە نیوەڕۆدا بوو،گەیشتینە شارەکە،خەڵکیم دەبینی هاوزمانی خۆمن،فرۆشیارەکان بە کوردی هاواریاندەکرد بۆ فرۆشتنی کەلوپەلەکانیان،هەستم بە ئارامی دەروونی دەکرد، غەریبی ماڵاوایی لێکردم،هەموو خەڵکیم بە کەسوکاری خۆم دەزانی،حەزمدەکرد یەکەبەیەکەی خەڵکی سەرشەقامەکان ماچ بکەم.کیژێکی بچکۆلەم بینیی،جلێ کوردی جوانی لەبەردا بوو، دەسەکانی لە نێو دەسی باوکیدا بوو، بێئەوەی یارمەتیی لە باوکی وەرگرم،دوو ماچم کرد،بە دوای مامە پیرەدا دەڕۆیشتم و ئاوڕم لێدەدایەوە،دەسم بەرزکردبووەوە،ئەویش دەسە خنجیلەکەی بەرزکردەوە وڕایدەوەشاند،باوکی سەری سوڕمابوو، بەلأم پێی خۆشبوو کە منداڵەکەی جوان و خنجیلەیە بۆیە ماچی دەکرێ.لە شوێنێك وەستاین،تاکسی گرت بەرەو ماڵی خۆیان، لە دەرگایدا،بە دەنگێکی بەرز گوتی:خونچە بیکەرەوە،هەر بە پەلە دەرگایان لێکردینەوە،دایە خونچە شانی مامە پیرەی ماچکرد، باوەشی لە منیشدا و ماچی کردم،مامەپیرە یەکسەر گوتی:

( ئەحمەد ) نەهاتوەتەوە؟

ڕێزان گوتی:باوکەگیان،(کاکە ئەحمەد ) دوو ڕۆژە هاتووەتەوە، دەستێکی بە ڕیشە سپییەکەیدا هێنا،گوتی:سوپاس بۆ خوا.

خانووەکەیان دوو نهۆم بوو،پیکابێکی تویۆتا لە نێو حەوشەکەدا بوو،دیاربوو بژێویان لەباربوو،نهۆمی سەرەوە ئەحمەد و (بەیان)ی خێزانی و دوو جگەر گۆشەکەیانی تێدا دەژیا، خوارەوەش مامەپیرە و دایە خونچە و ڕێزانی کچیان. ڕێزان تەنیا کچ بوو لە ماڵ مابوو،هێشتا شووی نەکردبوو.ئەحمەد و خێزانەکەی،بە پەلە هاتنە خوارەوە،دەسیان ماچکرد، بەڵام ئەحمەد زۆر تووڕەبوو لە باوکی و گوتی:تۆ چۆن هاتی بۆ نێو ئەو شەڕە، گەر بیانکوشتیتایە چییمان بکردایە؟!!

مامە پیرە گوتی:وا مەڵێ کوڕەکەم ،ئەم کچەی لەگەڵمدایە، لەو کچانەیە لە کارەساتی ئەنفالی بەدناو ئەنفالکراوە،وەك(جاریە ) بە ماڵە عارەبێکی کوێتیی فرۆشراوە،لە نێو شاردا بینیمی داوای یارمەتیی لێکردم ڕزگاری بکەم و بێتەوە بۆ کوردستان، منیش وازم لە گەڕان بە شوێن تۆدا هێنا،ئەم کچەم هێنایەوە،کە دەبێتە کچی ئەم ماڵە،سەلامەتیی تۆش لە نێوچەوانی ئەم کچەی دەزانم. ئەحمەد،لە تووڕەبوونی بەرانبەر باوکی زۆر پەشیمانبوو،داوای لێبووردنی لە من کرد و گوتی:خوشکی‌بەڕێزی و لە ئەوڕۆوە بە برا گەورەی خۆتم بزانە و یەکێکی وەك ڕێزان ی خوشکم.

گوتم:سوپاسی هەموو لایەکتان دەکەم ،نازانم چۆن پاداشی چاکەتان بدەمەوە.

ڕێزان گوتی: یاخوا بە خێربێی،تۆ خوشکی گەورەی منی،زۆر لە مێژە بە تەنیام،دەسی کردە ملم و بردمییە ژوورەکەی خۆی.

لەو ڕۆژەوە،لەو ماڵە زۆر ڕێزم لێدەگیرا،لەگەڵ ڕێزان لە ژوورە تایبەتەکەیدا پێکەوەبووین،هەر بە زبانیی ڕێزان،بانگی ئەندامانیی خێزانەکەم دەکرد،زۆر هۆگری ( فریا و ووریا ) بووم کە دوو جگەرگۆشەی ئەحمەدی کوڕیان بوو،زۆر پاکوبێگەرد بوون.

شەوانە،من و ڕێزان تا نیوە شەو نانووستین،خاڵ بە خاڵی دەفتەری یادەوەرییەکانم بۆ دەخوێندەوە،نهێنییەکانم لای ڕێزانی دەسەخوشکم درکان ولای ئەویش بووە نهێنیەکی پیرۆز.

داوای دەفتەرێکم کرد بۆ نووسینەوەی یادەوەرییەکانم ، ئەویش دوودەفتەری یادەوەریی هێنا ، یەکیان بۆ من و ئەوی دیکەیان بۆ خۆی، تاخۆیشی یادەوەرییەکانی ژیانی بنووسێتەوە.پێنجەمین دەفتەری یادەوەرییەکانم دەسپێکرد،لە پیرۆزی سەربازە کوردە دڵسۆزەکانەوە دەسم پێکرد،تا ئەو ساتەی لەگەڵ ڕێزاندا بووم.

نیوەشەو تێپەڕیبوو،لە هاواری خۆم بە ئاگا هاتم،ڕێزان لە هاواری من بە ئاگا هات،دایکی ڕێزان لە دەرگایدا گوتی:چییبووە کچەکانم، چییبووە؟!!

گوتم: دایەگیان هیچ نییە، خەوێکم بینیی.

گوتی: گەر دەترسن، ئەم شەو دێمە لای ئێوە.

گوتم:بە خوا هیچ نییە،خۆت ماندوومەکە،بچۆرەوە لای باوە حاجی.

ڕێزان هێندێ ئاوی بۆ هێنام و گوتی: خەونەکەت چیی بوو ؟

گوتم: ئەو ( عەبە ) یەی کوشتبووم، هاتە ژوورەوە و دەسی نایە بینا قاقام تا بمخنکێنێ، تەواو هەناسەی تەنگکردم ، زۆر لە مێژە لە ژێردەسی هاواردەکەم، ئینجا دەنگی دوا هاوارم دەرچوو.

(ئارەقم کردبووەوە، زۆر دەترسام، حەزم نەدەکرد بنوومەوە، ڕێزان، بۆ هێوربوونەوەی دڵی من، بەو شەوە درەنگە ڕادیۆکەی هێنا، لە ئێسگەکان دەگەڕا.

گوتم: ڕێزان گیان با بنووینەوە، درەنگە.

گوتی:جارێ با نەنووین،با کەمێ ئارام بیتەوە،بەڵام نەمهێشت.

گوتی:بە مەرجێ،دێمە ژێر جێیەکەتەوە،دەسم لە نێو دەستدابێ، هەناسەمان تێکەڵ بە هەناسەی یەکدی بێ.

بەو شێوەیە تا بەیانی نووستین و کابوسەکە نەهاتەوە.

(٢٣)

سوپاکەی رژێم لە کوێت سەقامگیربوو،بە هۆیەوە من لە کۆیلەیەتیی دەربازبووم.وولاتانی زلهێز هەڕەشەیان لە ڕژێم کرد تا بگەڕێتەوە لە خاکی وولاتی کوێت،ئەویش بێباکانە،سووربوو لە سەر ئەوەی کوێت پارێزگای نۆزدەیەمینی عێراقە، لە کەناڵەکان گاڵتەی بە هەڕەشەی زلهێزەکان دەهات، هەموو سوپای عێراقیی لە کوێت کۆکردبووەوە بۆ بەرەنگاریکردن لە کاتی هەر هێرشێکی زلهێزەکان.وولاتانی هاوپەیمان هێزیان لە بەرانبەر هێزەکانی ڕژێم کۆکردەوە، دوا کاتیان بۆ گەڕانەوەی دیاریکرد. لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٩١ گورزێکی کاریگەریان لە رژێم وەشان ،چەن شارێکی عێراقیان داگیرکرد، سەدام دەیویست لە ژێرزەمینەکانەوە وورەی سوپاکەی بەرزکاتەوە، بەلآم بێسوودبوو.ئەم بێهێزییەی ڕژێم، سوودی هەبوو بۆ گەلەکەمان، راپەرینێکی پێشمەرگە و جەماوەر لە دەروازەی راپەرینەوە، لە ٣/٥/ ١٩٩١ بە یەك دەنگ، بەرپابوو ،من و رێزان گوێمان رادەگرت لە هاواری بێژەرەکان، لە کاتی ئەنجامدانی چالاکییەکان و لێدانی مۆڵگەکانی رژێم ئازادبوونی بست بە بستی خاکی کوردستان وورەی بەرزکردینەوە.

خۆزگەم دەخواست بمتوانیایە خەباتی هێزیی گیانی تۆڵەی کچان دەسپێکەمەوە،(رێباز)ی برام دەهاتە پێش چاو کە چۆن پەلاماری مۆڵگـەکانی رژێـم دەدا وتۆڵـەی ئێمـە و گەلەکـەی دەکاتـەوە، دڵنیابووم ئێستە پێشمەرگەیە،چونکە زۆر دڵسۆزبوو بۆ گەلەکەی و بۆ هێـزی پێـشمەرگە,کـاتیٚ شـارەکەمان رزگـارکرا ،لەگـەڵ رێـزان و کـاك ئەحمەد،بـە تویٚتـا پیکابەکـە پیاسـەیەکی نێـو شـارمان کـرد، پێشمەرگەم دەبینی فرمێسك لە چاوانم دەباری، چاوەکانم ئارامیی لێبڕابوو،تەماشـای هـەموو پێـشمەرگەیەکم دەکـرد و دەمگـوت:دەبـیٚ لـە پڕێکدا رێبـاز نەبینمـەوە؟!! بـەلاّم نەمبینییـەوە و گەڕاینـەوە.دوا پارێزگای کوردستان کە (کەرکوك)بوو،ئازادکرا و تەقەی خۆشی بۆ کرا،بـەلاّم رژێـم چـونکە سـەری پـان نـەکرابوەوە ،بـە سـوپایەکی بێشومارەوە رووی کردە کوردستان،کۆڕەو دروسبوو.

گـوتم: بـاوە حـاجی تـەنیا مـن دەزانـم رژێـم چـەن دڕندەیـە، بـا زوو خۆمان رزگارکەین و ئەنفال نەکرێینەوە، بە کیمیاباران نەسووتێین، بـا پەلـە بکـەین وبـڕۆین.پیکابـە تویٚتاکـەیان پـڕ کەلوپـەل و پێداویستییکرد،منیش پارە و دەفتەری یادەوەرییـەکانم هـەڵگرت و چووین بەرەو سنوورەکان، چەندین هەزارکەس لە ژن ، منـداڵ ، پـیر پەککەوتـە و گـەنج روو لـە سـنوورەکان بـوون.لـە رێ هـەر چـاوم دەگێڕا، ئاخۆ رێبازی برام نابینمەوە، بەلاّم رێباز هەر نەبوو.

پـاش چـەن مـانگێ لـە کـۆڕەو و ئاوارەبوونمـان لـە وولاتـانی دراوسێ، رژێم لێبوردنی دەرکرد و خەڵکی گەڕایەوە، سنووری بۆ رژێم دانرا،بە بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان،هێڵی ٣٦ ی بۆ دانرا کە نابێ رژێم پەلاماری ئەو ناوچانە بدا کە لە سەر ئەو هێڵەن، ئەو هێڵە شارەکانی کوردستانی دەگرتەوە،رژێم بە ناچاری پاشەکشێی کرد لە سێ پارێزگای کوردستان،بەشێ لە کوردستان ئازادکرا و کەوتە دەسی پارتە سیاسییەکانی خۆمان،بووە هۆی هەڵبژادن،لە دایکبـوونی پەرلـەمانی کوردسـتان و دامەزرانـدنی حکومـەتی هەرێمی کوردستان.

(٢٤)

ئەو شەوە، لە دەفتەری یادەوەریی من و ریزان ، کۆتاییمان هێنا بە نووسینەوەی قۆناغەکانی راپەرینە مەزنەکەی کوردستان ، کۆڕەو و ئازادبوونی کوردستان.

بە (ڕێزان)م گوت:زۆر حەزدەکەم ئەو پارە کوێتییەی لە دۆلابەکە دایە وباوە حاجی ناهێڵێ بیگۆڕم،نەوەك پێداویستیی خۆمی پێدابینبکەم،دەمەوێ بیدەم بە کاکە ئەحمەد و لە بازاڕی پارە گۆڕینەوە بیکاتە پارەی خۆمان،بەڵام من خۆم پێم شەرمە،بەڵکو تۆ بە کاکە ئەحمەد بڵێی.

ریزان گوتی: بە سەرچاو، بەیانی دەیدەمە دەسی تا بیگۆڕێ.

هەر بەیانی زوو، ریزان کاکە ئەحمەدی بانگکرد بۆ ژوورەکەمان و پریاسکە پارەکەم پێدا .ئێوارێ لە کاری رۆژانەی پیکابەکەی بۆ ماڵ گەڕایەوە،بە دوو پریاسکەوە هاتە ژوورەکەمان و پارەیێ زۆری پێبوو،زۆر هەوڵمدا هێندێ لە پارەکەم لێوەرگرێ بۆ خۆی و بۆ پێداویستیی ئەم ماڵە دڵسۆزە،بەڵام ڕازی نەبوو و هەڕەشەی لێکردم کە نابێ بۆ هیچ پێداویستییەکی خۆمیش بەکاری بێنم.

ڕێزان گوتی:باوە حاجی بزانێ بۆ پێداویستیی بەکاری دێنی، زۆر لێت زویر دەبێ،لەبەر ئەوە نابێ بە هیچ شێوەیێ باسی بکەی.

سوپاسیانم کرد و گوتم: نازانم بە چیی پاداشتی ئێوە بدەمەوە.
کاکە ئەحمەد گوتی: دەزانی پاداشتی من چییە؟!! هەمیشە بە ڕوو خۆشی بتبینم و خەیاڵ لە ناخۆشییەکان نەکەیتەوە.

گوتم: کاکە ئەحمەد زۆر سوپاستدەکەم،دڵنیابە هەوڵدەدەم خۆم لە خەیاڵە ناخۆشەکان بشارمەوە.

گوتی:ئەوە پاداشتی منە،پێکەنی و چووەوە بۆ نێو خێزانەکەی.

گوتم: ڕێزان گیان، ئێستە هەموو هیوایەکم ئەوەیە، بتوانم ڕێبازی برام بدۆزمەوە،هاوسەرێکی جوانی بۆ بێنم،تا مردن لە خزمەت وبە خێوکردنی جگەرگۆشەکانیدا بم.گەر سبەینێ لەگەڵمدا بێی،لە ئێستەوە زێڕ دەکڕم،بۆ (نیشان) و دایدەنێم بۆ ئەو کچەی دەبێتە بووکم،بە دڵنیاییەوە خەسوویەکی زۆرباش دەبم، زۆریش حەزدەکەم ئەوەی دەیکڕم بە دڵی تۆ بێ.

ڕێزان:بۆ بە دڵی من بێ،با بە دڵی ئەو کچە بێ بۆ براکەتی دێنی.

گوتم: ڕێزان، زۆر لە مێژە حەزدەکەم قسەی نێو دڵمت بۆ بکەم.

ڕێزان: تۆ زۆر قسەت بۆ کردووم،بۆچی هیچت لێشاردوومەتەوە؟

گوتم: ئەوەی دەمەوێ بیڵێم، ڕازی بوونتە بە هاوسەرێتی ڕێبازی برام، هەر بۆیە حەزدەکەم نیشانەکە بە دڵی تۆ بێ، بزەیەکی شەرماویی کچانەی کرد،گوتی:نەسرین گیان من لە ڕێبازی برات پیاوتر شوو ناکەم،تۆش خۆشەویسترین دەسە خوشکی منی،

خۆشحاڵدەبم ببی بە خەسووم و تا مردن پێکەوە ژیان بە سەربەرین،بەڵام من چاوم لە زێڕ نییە،چاوم لە کوڕێکی باشە.

کەمێ شەرم گرتبووی،ڕوومەتەکانی سووربیوونەوە،باوەشم لێدا وچەن ماچێکم کرد،بۆ یەکەمجار فرمێسکی گریانی خۆشییم ڕشت.

بۆ بەیانی،یارمەتیمان لە دایە خونچە و باوە حاجی وەرگرت و چووین بۆ بازاڕ،چووینە دوکانێکی زێڕفرۆش لە بازاڕی زەڕەنگەران،دوو ئەڵقەی هەڵبژارد، لەگەڵ ملوانکەیەکی زۆر جوان، ئەڵقەکەم کردە پەنجەی،ئەویش ئەڵقەکەی ڕێبازی کردە پەنجەم ماچم کرد،بۆ یەکەمجار گوتم:براژن گیان نیشانەکانت پیرۆزبێ. شەرمی دەکرد،دایکەن و کردمانە زەرفێکەوە،ناوی ڕێباز و ڕێزانم لە سەری نووسی،لەگەڵ دەفتەری یادەوەرییەکاندا هەڵمان گرت، دۆزینەوەی ( ڕێباز ) ی برام بووە هیوای هەردووکمان.

(٢٥)

ڕێکخراوە بیانیەکان ڕوویان کردە کوردستان بۆ گەشەپێدان و ئاوەدانکردنەوەی کوردستان بە تایبەتیی گوندەکان، کەناڵەکانی تێلیێفزیۆنی کوردستان چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ئەو خەڵکانەدا دەکرد،گەڕابوونەوە گوندەکانیان وئاوەدانیان کردبووەوە.هەرکاتێ ئەو بەرنامەیە ببوایە باوە حاجی بانگیدەکردم ،چونکە دەیزانی تامەزرۆی ئەو هەواڵانەم.شەوێکیان دانیشتبووین لەگەڵ باوە حاجی و دایە خونچە، گوندی ئێمەی پیشاندەدا، چاوپێکەوتنیان لەگەڵ ( مەلا ئەحمەد ) سازکردبوو،بۆ یەکەمجاربوو لەبەردەم باوە حاجی دەسکاری دەنگی تێلیێفزیۆنەکە بکەم،هۆشم لای خۆم نەمابوو،سەیری شوێنەواری خانووەکەی خۆمانم دەکرد،تەزووی بە لەشمدا دەهێنا، چاوم لە ڕێباز دەگێڕا، بەڵام بێسوودبوو، تەنیاماڵی مەلا ئەحمەد و دوو سێ دراوسێی دی گەڕابوونەوە گوند، چونکە ئەمانە لە کارەساتی ئەنفال بۆ سنوورەکان ڕەویانکرد.ئەو بەرنامەیە تەواو بوو،هەموو هیوام گەڕانەوە بوو بۆ گوندەکەمان، چونکە پارەم هەبوو دەمتوانی خانوویێ دروسکەم و ڕێباز بدۆزمەوە،(ڕێزان )ی بۆ بێنم.

گوتم:باوە حاجی زۆر حەز لە سەردانی گوندەکەمان دەکەم، دڵنیام ئەوان ئێستە دەزانن ڕێباز لە کوێیە.

گوتی:بە سەرچاو کچەکەم،سبەینێ بەیانی زوو،من،تۆ و ئەحمەد بە پیکابەکە دەچین بۆ گوندەکەتان،بەڵکو سۆراغی کاکە ڕێباز دەکەین.پەلاماری دەسیمدا وماچم کرد،ئەویش سەری ماچکردم،گوتی:تۆ کچی منی،هەرچییت بوێ دەیکەمە سەرچاوم.

لەگەڵ ڕێزان چوومەوە ژوورەکەی خۆمان،بەلاّم نەمدەتوانی بنووم چونکە ساڵانێکە تامەزرۆی بینینی گوندەکەمان بووم.ڕێزان زۆر دڵیخۆشبوو،بەیانی دەڕۆین و هەواڵی ڕێباز دەپرسین، دەیگوت:نابێ شەوتان پێبچێ،چونکە تا دێنەوە،ناتوانم ودڵم دەتەقێ.

گوتم: هیچ غەمت نەبێ، ئینشەڵلا هەموو شت بە دڵی خۆمان دەبێ.

(٢٦)

بەیانی زۆر زوو، هەرسێکمان بە پیکابەکە دەرچووین بەرەو گوند،لە شەقام لاماندا و چووینە سەر ڕێی خۆڵ و چەو،ڕوو لە گوندەکانی ناوچەکەمان ،بەو ڕێیەدا دەڕۆیشتین چەندینجار پێیدا ڕۆشتبووم.ئاگاداری ئەوە نەبووم لە نێو ئوتومبێل و لە نێوان دووکەسەوە دانیشتووم،وامدەزانی باڵندەی لەق لەقم،بەهارە و دەگەڕێمەوە هێلانەی سەر منارەی مزگەوتی گوندەکەمان، ئەندامەکانی جەستەم هەموو ببوون بە چاو،تەماشای چەم ،باغ ، ئاوی سازگاری کانیاوەکان،گوڵاڵە سوورە و گوڵە نێرگزی پێدەشتەکانیان دەکرد.

کاکە ئەحمەد گوتی: بە ڕاستی ناوچەیەکی خۆشتان هەیە.

بە ئاگا هاتمەوە، گوتم: بەڵێ ڕاستدەکەی.

گوتی: نەمگوت خۆت لە خەیاڵی ناخۆش بە دوورگرە.

گوتم:ئێستە لە خەیاڵدا ناژیم،ڕاستییەکە و ماوەیێ دووروودرێژە بە خەیاڵییەوە دەژیم،هەموو هیوام گەڕانەوە بوو بۆی

گوتی: ناوچەکەتان زۆر خۆشە.

گوتم:کاکە ئەحمەد،با گوندەکەمان ببینی،بزانە چەن خۆشترە!!

باوە حاجی گوتی: زۆرمان ماوە؟

گوتم:زۆری نەماوە،لەم ڕێیەوە و ئەو دۆڵە دەبڕین،گوندەکەمان نزیك ئەو شاخەیە،بەڵام زۆر داوای لێبوردنتان لێدەکەم، ئێوەم زۆر ماندووکرد. هەردووکیان گوتیان: قسەی وامەکە، تۆ کچی ئێمەی. زۆر سوپاسیانم کرد.

گەیشتینە نزیك گوند،گوتم:باوە حاجی،خەڵکی ئاواییان لێرە کۆکردەوە وئەنفالیانکردین،حەپەسابووم،هەر سەیری شوێنەکەم دەکرد،لەو شوێنەوە،خەڵکی ئاوایی دەسیان بەرزکردبووەوە، خێرهاتنەوەیان لێدەکردم،( باوە حاجی و کاکە ئەحمەد ) بێدەنگ ببوون،دیاربوو کاری لەوانیش کردبوو .

دایکم باوەشی بۆ کردبوومەوە، دەیگوت: بۆ درەنگ هاتییەوە، بۆ ڕێبازت لەگەڵ نییە!!. گریان قوڕگی گرتبووم.گەیشتینە نێو ئاوایی بە کاکە ئەحمەدم گوت:لای ئەم ماڵە ڕایبگرە.کە وەستاین، نازەنین بە پەلە هاتە دەرگا،کە منی بینیی هاواریکرد و گوتی، دایەگیان نەسرین هاتەوە،دەسمان لە ملی یەکدی کرد، فرمێسك بارانی یەکدیمان کرد.( مەلا ئەحمەد ) و (مەلا ژنە گوڵە ) هاتنە دەرگا،باوە حاجی و کاکە ئەحمەد لە گەڵ مەلا ئەحمەد دەسی یەکدییان ماچکرد،منیش دەسی مەلا ژنە گوڵە و مەلا ئەحمەدم ماچکرد. نازەنین دەسی لە نێو دەسم نابوو،سەرم داخستبوو و بە هێمنی دەگریام.چووینە ژوورەوە و دانیشتین،بەڵام نەمتوانی زۆر

دانیشم لەگەڵ نازەنین پارمەتیمان وەرگرت وچووین بۆ شوێنەواری خانووەکەمان،کە لە تەنیشت ماڵی نازەنین بوو,جاروبار شوێنەواری خانووەکە دەبووە خانووەکەی جاران ، (باوك ، دایك، ڕێباز و نەریمان)م تێدا دەبینی،گوێم بە دەنگەکان دەزرینگایەوە،دەنگی ئاوازی شمشاڵی نەریمان دەهاتە گوێم،پێش چاوم دەسووڕا،لە شوێنی خۆم دانیشتم،نازەنین گوتی: بۆ وادەکەی ( نەسرین ).نەمتوانی وەڵامیبدەمەوە،ئەویش دەسیکرد بە گریان وباوەشی لێدام و منیش زۆر گریام، بە گریانەکە بە هۆشی خۆم هاتمەوە، دەسی یەکدیمان گرت و هێدی هێدی بە نێو حەوشەکەدا دەڕۆیشتین،چووینە لای شوێنەواری کادینەکە،نەرمە گیایەکی سەوزی لێڕووابوو،نازەنین گوتی: بادابنیشین لێرە و کەمێ پشووبدەین.کە دانیشتین، هێواش هێواش دڵودەروونم ئارام بووەوە،ئیدی لەگەڵ نازەنین کەوتینە باسی بەسەرهاتەکان،نازەنین گوتی:نەسرین گیان بە خوا زۆر دڵم پێتکرایەوە,ئەو ڕۆژەی لەگەڵ باوکم لە شاری (سلێمانی) بووین ،ڕێبازی براتم بینیی،زۆر گوتمان ماڵتان لە کوێیە؟ دەیگوت: نازانم.

گوتمان: دەماننناسی؟.

گوتی: ئا. بە ڕاستی زۆرمان پێناخۆشبوو کە ( شێت ) بووە،خوا ئەوکەسە بگرێ وای لێکردن.

لەگەڵ ئەو هەواڵە دڵتەزێنە نەمدەزانی شەوە یا ڕۆژ، بووڕابوومەوە، کە هۆشم هاتەوە لە ماڵی نازەنین بووم،خەڵکی

ئـاوایی هــەموو کۆببوونەوە،نەمـدەزانی چـۆن منیـان گەیانـدبوەوە مـاڵی مـەلا.نـازەنین هــەر دەگریـا،زۆر پەشـیمانبوو ئـەو هەواڵـەی پێگوتم،چـونکە نەیـدەزانی مـن نـازانم و تـا ئێـستە ڕێبـازی بـرام لێوونە.

لـە نزیکـی عەسـردا بـوو، خـواردنی نیـوەڕۆ ئامـادەکرا ،بە هـۆی منەوە درەنگ کەوتن و زۆریـشم پێناخۆشبوو.هـەموو زانیـان ڕێبـاز شـێت بووە،بـەڵام هـیچ کـەس ئـەو باسـەی نـەدەکردەوە تـابرینم نەکولێتەوە.ماڵی مەلا ئەحمەد نەیانهێشت بڕۆینەوە،شەوێ خەڵکی ئـــاوایی لـــە مـــاڵی مـــەلا ئەحمـــەد کۆبوونـــەوە،بووە پرســـەیێ، سەرخۆشـیم لێـدەکرا ،ئـەو شـەوە مـن و نـازەنین لـە ژوورێکـدا نووستبووین، هاژەهاژی چەمەکە و قیڕەی بۆق، ببونە دوو ئاوازی بە سۆز ،بە هێمنی دڵیان ئارام دەکردمەوە.

بـەیانی زوو هەسـتاین، جـارێکی دی لەگـەڵ نـازەنین تەماشـای شـوێنەواری خانووەکـەم کـردەوە گـوتم: نـازەنین، مـن پـارەیێ زۆر باشم هەیە، دەمەوێ خانووەکەمان دروسکەمەوە ، ڕێبـاز بدۆزمـەوە و بگەڕێینـەوە گونـد.زۆری پێخـۆش بـوو و گـوتی: دڵنیابـە هـەموو هاوکارییـەکت دەکـەم. گەڕاینـەوە باسـەکەم بـۆکردن ،بـاوە خـاجی یەکەمجار ڕێگربوو،پاڕامەوە و دەسیم ماچکرد تا هاوکارییم بکا. ڕازی بـوو بـە گەڕانـەوەم ،ئیـدی هـیچ کـەس نـەبووە ڕێگـرم. کاکـە ئەحمەد گوتی: منیش وەستای هاوڕێم هەیە، کەرەسـەی بینـاکردن و دروسـکردنی بیناکـە دەگرێتـە ئەسـتۆ.ئـەویش دڵـی خۆشـکردم،

مـاڵی مـەلا ئەحمـەد وخـەڵکی ئاوایی،هانـدەرێکی دی بـوون بـۆ گەڕانـەوەم .ڕێبـازیش لـە گـەڕانی سـەر شـەقامەکانی نێـو شـار ڕزگاربکەم.

ماڵاوایيمـان کـرد وگەڕاینـەوە بـۆ شـار.کـە چووینەوە،بەو ڕەنگـە شـێواوەمەوە،ڕێزان باوەشـی پێـداکردم و دەسـی بـە گریـان کـرد، سەرمـسوڕما،وامدەزانی پێیـان گوتووە،گـوتی:ئـەی ڕێبـاز؟!! بـە گریانـەوە، گـوتم: ئـەو بـرا تاقانەیـەم هەبوو،ئـەویش بـە کاریگـەری کارەسـاتی ئـەنفال شـێت بـووە, ئێـستە نـازانم لـە چ شـارێك بـە شەقامەکاندا دەسووڕێتەوە و خەڵکی گاڵتـەی پێدەکەن. ماڵی باوە حاجی هەموویان پەرۆش بوون بۆ ئەو هەواڵە دڵتەزێنـە، گوتیـان: خەمت نەبێ، لە هەر شارێ بێ دەیدۆزینەوە و دەیهێنینەوە.

گـوتم: تـا خانووەکـەمان لـە گونـد دروسـنەکەمەوە، ڕێبـاز نادۆزمـەوە، چونکە دەزانم شار بۆ ئەو نابێ، گوند باشترین چارەسەرێتی.

شەوێ لەگەڵ ڕێزان، گریانمان بۆ یەکدی دەسەنەوە، ڕێزان دڵنەوایی دەکـردم و دەیگـوت: مـن گـەر شـێتیش بـێ، شـووی پێدەکـەم تـەنیا تـۆ کـەمێ هێووربـەوە،جێم مەهێڵـە!! دەمزانـی تـازە کـار لـە کـار تـرازاوە جگەرگۆشەی ڕێبازی برام نابینم،هەر خۆم چۆن دێڵم کچێ وەك ڕێـزان شوو بکا بە شێت ،با شێتەکەش برام بێ.

( ٢٧ )

پاش سێ ڕۆژ، کاکە ئەحمەد گوتی، وەستایەکم پەیدا کردووە بۆ دروسکردنی خانووەکەت، هەر سبەینێ دەچین بۆ گوندەکەتان و شوێنەکە نیشان دەکەین کە چۆن دروسیبکا. هەرچی پارەیەکم هەبوو دامە دەسی کاکە ئەحمەد، جارێکی دی چووینەوە بۆ گوندەکەمان، هەر لە شوێنەواری خانوەکەمان، "دوو ژووری دواوەی کادینەکە،گەوڕ وژووری تەنیشت گەوڕم" نیشانکرد، ئیدی وەستا دەسی پێکرد.لە ماوەی دوو مانگ،کلیلی بۆ هێناین،پاش وەرگرتنی کلیلەکان، کاك ئەحمەد گوتی:دەزانی هێشتا پارەیێ زۆرت ماوە، زۆر حەزم دەکرد و زۆر هەوڵمدا هێندێ لە پارەکەم لێوەرگرێ، چونکە زۆر ماندووببوو بە خانوو دروسکردنەکەوە، بەڵام سوودی نەبوو و دەیگوت:ئەی برا گەورەت بۆ چییە ؟پاشان گوتی:گەر حەز دەکەی،شارەکانی کوردستان هەموو دەگەڕێین تا (ڕێباز)یش دەدۆزینەوە.

گوتم: دەزانی ئەمە خۆشترین هەواڵبوو!!بەڵام حەزدەکەم ڕێزانیش لەگەڵمان بێ،دەچین بۆ شاری (سلێمانی)،چونکە نازەنین دەیگوت: لەو شارەدا بینیومانە.

( ٢٨ )

بەرەبەیان بوو، هەرسێکمان ڕۆیشتین بەرەو شاری ( سلێمانی)، پاش چەن کاژێرێ گەیشتینە شارەکە،هەرسێکمان چاومان لە شێت دەگێڕا،چووینە نێو بازاڕ، لە شوێنێکدا خەڵکی کۆببونەوە و پێدەکەنین، کاکە ئەحمەد یەکسەر وەستا، گوتی: بە دڵنیاییەوە ئەو خەڵکە لە شێت کۆبوونەتەوە،بە پەلە خۆمان گەیاند.ڕاستبوو،بەڵام (ڕێباز)ی برام نەبوو،کاکە ئەحمەد پرسیاریکرد،شێتی دیکە لەم شارە هەیە.یەکێ گوتی:زۆر هەیە،هەریەکە وبە شتێکەوە گرتوویەتی.

گوتم:هەیە ناوی ( ڕێباز ) بێ؟.

گوتی:بەڵێ،ڕێبازە شێت هەیە، وێنەی سەرکردەکانی لە سەر سینگە،زۆر لای ترافیك لایتەکان دەوەستێ.

گوتم:کاکە ئەحمەد،ئەو شێتەی ئەم برایە باسی دەکا، ڕێبازی برامە،چونکە زۆر سەرکردە و پێشمەرگەکانی خۆشدەویست.

سواری پیکابەکە بووین و بە خێرایی ترافیك بە ترافیك لایت دەگەڕاین.بێهیوابووین کە نایدۆزینەوە،ئەمجارەیان لای ترافیك لایتێ گڵۆپی سوور هەڵبوو و وەستاین،کوڕێ لەو بەری

شەقامەکەوە وەستابوو "بالآبەرزێکی لاواز ,چاوەکانی بە قوڵدا چووبوون،جلێکی کوردیی لەبەردا بوو,چەن وێنەی سەرکردەی لە سەر سینگ بوو.یەکسەر گوتم:کاکە ئەحمەد،لەو پێشەوە بووەستە ئەوە (رێباز )ی برامە!!.هەرسێکمان دابەزین ,خۆم گەیاندە رێباز، باوەشێکم لێدا وماچم کرد,هەر پێدەکەنی و هیچی نەدەگوت، گوتم:رێباز من (نەسرین) ی خوشکتم،وەرە با سوار ئەو پیکابە بین و بڕۆینەوە بۆ گوندەکەمان.(رێباز ) تەماشایدەکردم و هیچ قسەی نەدەکرد،بە زەردەخەنەوە وبە بێدەنگ دەسی بە وێنەکانی سەر سنگیەوە دەهێنا،کە ئاوڕمدایەوە،خەڵکێکی زۆر کۆببوونەوە، وایاندەزانی هەر گاڵتە پێکردنەکەی هێندێ لە خەڵکی شارەکەیە بۆ شێت،بەلآم کە وورد دەبوونەوە،من بە ڕاستی قسە لەگەڵ( رێباز) دەکەم،سەریان سوڕمابوو.

کاکە ئەحمەد گوتی:کاکە ( ڕێباز)،با بڕۆین تا لەگەڵ (نەسرین)ی خوشکتدا بتانگەیەنمەوە گوندەکەتان.

گوتی: نایەم، نا.

گوتم:ڕێباز گیان، دەچینەوە گوندەکەمان، بۆلای دایەو باوە.

گوتی:درۆدەکەی،ئەنفالکران، گوندەکان ڕووخان،مەڕەکانیان برد، درۆ دەکەی، درۆ.دەسم بە گریان کرد، نەمدەزانی بە چ ڕێیەك براکەم بەرمەوە،توڕەبووم،گرتم بە قۆڵیدا،ویستم بیکەمە نێو پیکابەکەوە،بەلآم لە شوێنی خۆی چەقیبوو و نەدەجولآ،لەگەڵ

کاکە ئەحمەد وریزان زۆر هەولماندا،بەلام سوودی نەبوو. "کوڕێکی گەنج، قاتێکی چاکەت و پانتۆلی لەبەردا بوو"، گوتی: تۆ بە ڕاستی خوشکی ئەم کوڕەی؟.

گوتم:بەلێ براکەم ،ئەم برایەم تاقانە بوو،زۆر ژیر بوو،دلسۆزی گەلەکەی بوو،لە کارەساتی ئەنفال،دایك و باوك و منیان گرت ، مالیان تالانکردین و ئەنفالکراین،بەو کارەساتە براکەم شێت بوو. زۆر گریام،خەلکیش چاویان پڕ ببوو لە فرمێسك،ڕیزانیش چاوەکانی سووربوون،کاکە ئەحمەد بێدەنگببوو.گەنجەکە ڕووی کردە خەلکەکە گوتی: "خەلکینە،کە شێتێ دەبینن بێنەوەی بیرکەنەوە بۆچیی شێت بووە،ئایا ئەمە پێش شێت بوونی چ مرۆڤێ بووە،یەکسەر گالتەی پێدەکەن و رابواردنی رۆژانەتانی پێبەسەردەبەن،بێنەوەی بەزەییتان پێدابێتەوە،دلنیابن ئەمانە لە ئێمە دلسۆزتربوونە بۆ خاکی نیشتمان، هەر لە عیشق و دلسۆزیان بۆ نیشتمان شێت بوونە ،هەموو شێتێکی گەلەکەمان مێژوویەکی پڕ سەروەری لە پشتەوەیە،هەر شێتێ دەبینی،کارەساتێکی دلتەزێنیی دوژمنان دێنێتەوە یادمان" .ئەم شێتەی دەیبینن، وێنەی سەرکردەکانی کوردیی بە سینگیەوە هەلواسیووە،خەلکی گوندەکانە،بە کارەساتی ئەنفال، دایك وباوکی و سەروەتەکەیان لە نێو چووە،مالی باوکی ئەم شێتە شوێنی پشوودانی چەندین پێشمەرگە بووە،هاوکاریی پێشمەرگەیان کردووە،پالپشتی

شۆڕشەکەیان کردووە بۆیە ئەنفالکران، تۆزێ بیرکەنەوە لە شێت و بەزەییتان پێیاندا بێتەوە.ڕووی کردە ڕێبازی برام، گوتی: بۆ لەگەڵ خوشکت بۆ گوندەکەتان ناچییەوە؟. شانێکی هەڵتەکان و گوتی: ناچم، ناچم، ناچمەوە.بە منی گوت: ئەم برایەت حەزی بە چییدەکرد؟ دڵی بە چیی خۆشدەبوو؟

گوتم: دڵی بە مەڕومالآت و گوندەکەمان زۆر دەکرایەوە ،حەزی بە تێکەڵبوونی پێشمەرگە و کادیران دەکرد.

گەنجەکە گوتی:ڕێباز،گەر خوشکت مەڕت بۆ بکڕێ دەچیتەوە؟! سەری بەرزکردەوە،سەیرێکی گەنجەکەی کرد،تەماشای منیشی کرد،بزەیێ زۆر جوانی کرد و گوتی: ئا، ئا، مەڕ بکڕن دەچمەوە. گەنجەکە قۆڵی خستە قۆڵی ڕێبازەوە و گوتی: با بچین سواری ئەو پیکابە بین و بڕۆین مەڕ بکڕین،هێدی هێدی دەڕۆیشتن، قۆڵم خستە نێو قۆڵی ڕێبازەوە و چووینە لای پیکابەکە،کاکە ئەحمەد دەرگای پێشەوەی بۆ کردەوە،بەلآم ڕازی نەبوو بچێتە پێشەوە،دیسانەوە بیانووی گرت، کەمێ وەستا، ئێمەش وەستاین، ئینجا بە دەسی هێمای کرد و گوتی:من لە دواوە دادەنیشم.زۆر هەوڵمدا و دەترسام بکەوێ،بەلآم هەر سوودی نەبوو.گەنجەکە گوتی: با لە دوای پیکابەکەوە بێ،هیچ ترسی نییە، چونکە هیوای ئەو شێتە گەیشتنە بە مەڕەکان. بە ناچاری سەرمان خست و زۆر سوپاسی گەنجەکەمان کرد،خەڵکی چەپڵەیان بۆ گەنجەکە لێدەدا.

ماڵاواییمان لێکردن و بە ڕاستی چووین بەرەو مەیدانی ئاژەڵان ، دوو مەڕمان کڕی و خستمانە دوای پیکابەکەوە، پتر دڵی خۆشبوو، دەسی کردە ملی مەڕەکان و هیوا خنجیلەکەی هاتە دی، چووینەوە بۆ ماڵی باوە حاجی.ئەو شەوە ڕێباز نەدەهاتە ژوورەوە،لە حەوشەکەدا لەگەڵ مەڕەکان یاری دەکرد،زۆر دڵی بە مەڕەکان خۆشبوو. هەر بۆ بەیانی چووینەوە بۆ گوند،خانووەکەمان زۆر بە جوانیی دروسکرابووەوە، مەڕەکانم بردە گەوڕەکەوە،ڕێبازم جێهێشت بۆ خەڵکی ئاوایی،خۆم لەگەڵ کاکە ئەحمەد بۆ شار گەڕامەوە ، بۆ کڕینی باشترین کەلوپەلی ماڵ.دوا شەوم بوو لەگەڵ ئەو خێزانە دڵسۆزە، بۆ بەیانی بە دوو پیکابەوە ماڵەکەمان گواستەوە بۆ گوند، ڕێزان دوا گوتەی ئەوە بوو دەیگوت: چاوەڕوانی ڕێباز دەکەم تاچاك دەبێتەوە،بۆ ئەوەی شووی پێبکەم.

(٢٩)

لەو خانووەی دروسمکردبوو،من ،رێباز و هەر دوو مەڕەکە ژیانمان تێدا بە سەر دەبرد،هەفتانە ماڵی باوە حاجی سەردانییان دەکردین،کاکە ئەحمەد پارەکەی بۆ هێنامەوە،بەلاّم زۆری مابووەوە.گوتم: کاکە ئەحمەد، حەزدەکەم پارەکەم بە مەڕ بدەم چونکە گەوڕەکەمان جێی مەڕێکی زۆری لێدەبێتەوە.

گوتی:بە سەرچاو،ئەو ئەرکەشی خستە ئەستۆی خۆی ، لە ماوەیەکی زۆر کورتدا،(حەفتا) سەر مەڕی کڕی و بۆی هێنامەوە ، کادێنەکەشمان وەك جاران لە کا پڕکردەوە، بۆ مەڕەکان.

زۆر ماندووبووین لە خزمەتکردنی مەڕەکان،رێباز بەو شێتییەی خۆی ماندووببوو،نازەنین جگە لەوەی زۆر هاوکارم بوو،زۆربەی شەوەکان لای من دەنووست،چونکە باوکی نەیدەهێشت بە تەنیا لەگەڵ رێباز بم. رێباز،ژووری تایبەتیی هەبوو،لای گەوڕی مەڕەکانەوە،من و نازەنین لە ژووری خوارەوە بووین.دەفتەری یادەوەرییەکانم لەدۆلاّبێکی تایبەتدا کلیل دابوو،حەزم نەدەکرد نهێنییەکانم کەسی دیکە بیزانێ،ئەو شەوە دەرمهێنا و یادەوەرییم دەنووسییەوە.

نازەنین گوتی:چیی دەنوسیتەوە؟

گوتم:خۆم خەریك دەکەم   حەزم نەدەکرد باسی نهێنییەکانم بۆ نازەنین بکەم، بەڵام ئەو شەوە هێند دڵتەنگبووم،پێویستم بە یەکێ بوو بەسەرهاتەکانی بۆ باسبکەم،ئاهی ناخی دڵ هەڵڕێژم.هەر پێنج دەفتەری یادەوەرییەکانم هێنا،نهێنییەکانم بۆ نازەنینیش باسکرد،دڵتەنگی کەمێ بەرۆکی بەردام.

بەیانی بە(نازەنین )م گوت:حەزدەکەم شوانێ بۆ مەڕەکان پەیدا بکەم،چونکە زۆر ماندووم و مەڕەکان زۆرن، گەر بکرێ بە باوکت بڵێی،شوانێکمان بۆ پەیدابکا.(هەر داواکارییەکم هەبوایە، نازەنین بە زوویی جێبەجێیدەکرد،حەزیدەکرد شتێ بکا کە من دڵم پێخۆشبێ)،بۆیە بە پەلە چووەوە بۆ ماڵ تا بە باوکی بڵێ.

رۆژێکیان نازەنین بە پەلە هاتەوە،زۆر پووی خۆشبوو،زانیم هەواڵی خۆشی هێناوە،هەر لە دوورەوە داوای مزگێنی لێدەکردم.

گوتم:نازە،چیی بووە؟.

گوتی:باوکم ناردوویەتی بە دوای کوڕێکی خزم،ئەویش خەڵکی ئەم گوندانەی لای خۆمانە ،کەسوکاری هەموو ئەنفالن، لە ماڵی خاڵۆی لە ئۆردوگا زۆرەملێکان دەژی.

گوتم:نازە زۆر سوپاس، بە ڕاستی ئەم هەواڵە مژدانەی دەوێ.

گوتی:نەسرین گیان،بێشایانە،بەڵام شتێ هەیە حەز ناکەم بیڵێم.

گوتم: توخوا چیی هەیە مەیشارەوە و بیڵێ.

گوتی:ئەو کوڕەی بۆ شوانیت دێ،ناوی (نەریمان)ە. تەزوویەکی عاشقانە ،ڕاچڵەکینی دڵم،وەڵامی (نازەنین )یان دایەوە.نازەنین ترسا،زانی کەمێ تێکچووم. گوتی: خۆزگە باسم نەدەکرد.

گوتم: هیچ غەمت نەبێ، هێند کارەساتی ناخۆش و هەواڵی کوتوپڕم بیستووە،دڵودەروون و مێشکم ڕاهاتوون،خوا دەکا ئەو زوو دێ و کەمێ لە ماندووبوونمان کەم دەکاتەوە، هیچمان ناوێ.

گوتی: دڵنیابە لەم ڕۆژانە دێت،چونکە ئەویش خەڵکی ئەم دەڤەرەیە و دڵی بەم ناوچەیە دەکرێتەوە.

(٣٠)

ئەو رۆژە لەگەڵ نازەنین خەریك پەچە ماڵین بووین، لە دەرگای ماڵی نازەنین درا،دڵم داخورپا،زانیم شوانەکەیە،نازەنین بە پەلە چووەوە بۆ ماڵ،هەر لە حەوشی خۆیانەوە،پێی ڕاگەیانم،گوتی:کاك نەریمانە. لە چاوەڕوانییدا بووم کە ئێستە باوکی نازەنین لەگەڵ شوانەکە دێنە ژوورەوە،بەڵام نەهاتن،نازەنین هات، گوتی:نەسرین گیان تۆ بۆ لایان دێی،یا ئەوان بێن؟.

گوتم: من دێمە خزمەتیان.پێکەوە چووین بۆ ماڵی نازەنین. چووینە ژوورەوە، مەلاژنە گوڵە چای تێدەکرد، مەلا ئەحمەد و نەریمان گفتوگۆیان دەکرد،نەریمان هەستایە سەر پێ،مام مەلا ویستی هەستێ نەمهێشت،بۆ کوڕەکەش هەر حەزم نەدەکرد،بەڵام خۆی بەڕێز دیاربوو "کوڕێکی باڵابەرزی لاوازبوو،کەمێ ریشی هەبوو،جلێکی کوردیی لەبەردا بوو"، فەرمووی دانیشتنیان لێکردم،دانیشتم.کوڕەکە هەر سەیری زەوی دەکرد، سەری هەڵ نەدەبڕی،شەرمی زۆردەکرد،وەك یەکێ وا بوو هاتبێ بۆ خوازبێنی.

مام مەلا گوتی:کچەکەم، ئەمە ئەو کوڕەیە بۆ شوانیت هاتووە، ناوی نەریمانە،کوڕێکی بێدەنگە، کەسوکاری ئەنفالن.

خێرهاتنم لێکرد وگوتم تۆ دەبی بە برا گەورەمان،تەنیا من و ڕێبازی برام لە ماڵداین و مەڕێکی زۆرمان هەیە ،پێویستمان بە یەکێ وەك جەنابت هەیە،چونکە من براکەم مێشکی زۆر تەواو نییە،حەزدەکەم لە پێش چاوی مام مەلا و مەلاژنە گوڵە و نازەنین هەرچیی داواکارییت هەیە بیڵێی.

گوتی:دڵنیابە هیچ ناڵێم،چونکە ئێوە هاوغەمی منن،وەك زانیومە براکەت بە هۆی کارەساتی ئەنفالەوە شێت بووە.دەبم بە شوانتان، چۆنت پێباشبوو ڕێگرنابم و پەسەندیدەکەم.

مەلا ئەحمەد گوتی: زۆرچاکە، من نەخۆشم و ناتوانم بێم ، با نازەنین بیّ و کارەکانی نەریمان چییە پێی بڵێن.هەستاین وچووین بۆ ماڵی ئێمە،ڕێبازم پیشانیدا،لەگەڵ گەوڕی مەڕەکان.ئەو ژوورەی کە لە تەنیشت گەوڕەکەوە بوو و ڕێبازی تێدا دەنووست،بە (نەریمان)مدا،ڕێبازیش هاتە ژووری تەنیشتم، بەو شێوەیە بووینە خاوەنی شوان.

بە ڕاستی زۆر لە ماندووبوونم کەمبووەوە،بە تایبەت نەریمان شارەزایی تەواوی هەبوو لە بەخێوکردنی مەڕ ومالآت،زۆر دڵسۆز، ڕاستگۆ و بە ئابڕووبوو، لەگەڵ ڕێباز هۆگری یەکدی ببوون و زۆر یەکدیان خۆشدەویست.

(٣١)

زۆر دڵم بە کاك نەریمان خۆشبوو، چونکە زۆر گونجاو بوو، وەك برایێ گەورە هەڵسوکەوتی دەکرد.پاش چەن مانگێ پێکەوە ژیان، رۆژێکیان کەمێ دڵم لێزویربوو،چونکە لە کاتی دۆشینی مەڕەکان سەیرێکی کردم،سەیرکردنێ عاشقانە،وەك تەماشاکردنەکانی شەهید نەریمان وابوو.زۆرم پێناخۆشبوو،بەڵام هیچ وەڵامێکم نەبوو،پاش تەواوبوون لە دۆشینی مەڕەکان،بە توڕەییەوە چوومە ژوورەکەی خۆم،هەستی کرد تووڕە بوومە.ئیدی بە بێدەنگی کارەکانی ڕۆژانەمان ئەنجامدەدا.

پاش دوو ڕۆژ لەو بێدەنگییەمان،گوتی: دوو رۆژ مۆڵەتم بدە دەچم بۆ ماڵی خاڵۆم.

منیش گوتم:بە ئارەزووی خۆت،دوو رۆژ بڕۆ، بەڵام زۆر ترسام هاوڕێیەکی دڵسۆزی رێبازی برام دەڕوا و لەوانەیە نەگەڕێتەوە.

چوو بۆ لای گەوڕی مەڕەکان،لەوێدا بە ڕێبازی گوت دەڕۆم. رێباز بەو شێتیی خۆیەوە دەپاڕایەوە ،دەیگوت: توخوا مەڕۆ،جێم مەهێڵە،ماچێکی رێبازی کرد و گوتی:دەڕۆم،بەڵام دێمەوە.حەزی دەکرد بێ ومالآوابوونم لێبکا،بەڵام شەرمیدەکرد لێم

نزیککەوێتەوە، حەزی دەکرد من بڵێم خواحافیزت، بەڵام من هیچم نەگوت،دەسی لە ملی رێباز کرد، ڕوو لە دەرگای حەوش ڕۆیشتن، سەگەکانیش بە کلکەلەقێ دوای کەوتبوون، ماچی رێبازی کرد و چووە دەرەوە. دڵم پڕبوو،هەستم کرد،کەسێ لە ماڵەکەم دەڕوا و جێی زۆر دیارە،هەستم لای بوو بۆ ماڵی نازەنین چوو، پاش ماوەیێ ئینجا مالآوایی لێکردن. زۆر ترسام نەتوانێ بێتەوە، چونکە لەو ڕۆژەوە زۆر شەرمی دەکرد،پەشیمانبوو بەلآم نەیدەتوانی پێم بڵێ.

لە نزیکی عەسردا بوو،مەلا ئەحمەد بۆ ماڵمان هات،دڵم داچڵەکی وترسام پێم بڵێ نەریمان ناگەڕێتەوە،بەلآم گوتی: حەزدەکەم پێکەوە وەك کچ و باوك،عەسرە چایێ بخۆین.

گوتم: مامەگیان ماڵی خۆتە،زۆر گەورە دەبم،فەرموو، فەرموو، یاخوا بەخێر بێی.سەماوەرم داگیرسان و چایەکەم بە پەلە لێنا. گوتی:کچەکەم من بۆ کارێکی خێرهاتووم،حەزم نەدەکرد کەس بزانێ،هەر بۆیە نازەنینم لەگەڵ خۆم نەهێنا،چونکە نەریمان گوتی: با زۆر نهێنیی بێ.

دڵم کەوتە لەرزین،بە زۆر توانیم بڵێم :فەرموو مامەگیان.

گوتی:ئەوی راست بێ،نەریمان بۆ خوازبێنیت ناردوومی "دەڵێ بە ڕاستی کچێکی بە ئابڕوو و خانەدانە،من هەر دەبێ ژن بێنم، لەو باشترم دەسناکەوێ،با دڵنیاش بێ لەبەر سەروەت و سامانیم نییە،

تەنیا کچێکە و چووەتە دڵمەوە" قورگم پڕ لە گریان بوو،بە دەستی لەرزۆکمەوە چاییم تێکرد و دامە دەسی مام مەلا،کەمێ بێدەنگ بووم پاشان گوتم: مامەگیان، پەیمانم داوە شوونەکەم،تا مردن خزمەتیی ڕێباز بکەم و لە مەرداری بەردەوام بم.

گوتی:کچەکەم،تۆ هەر لە ماڵی خۆت دەبی،ئەو هەر خۆی بە شوانت دەزانی،دەسی بە باخەڵیدا کرد و سەیرێکی کاژێرەکەی کرد و گوتی:کچەکەم، ئێستە بۆ نوێژ درەنگە،جارێ هیچ وەڵام مەدەرەوە،بەڵام بە قسەی مامی خۆت دەکەی،نیوەی ئیمانت مسۆگەر دەکەی،هەردووکتانیش کەسوکاری ئەنفالکراوەکانن، هەستایە سەرپێ و بە بزەیەکەوە،گوتی: ئینشەڵڵا خوا دڵت نەرم دەکا،من جارێ بە دوعا، تا دەرگا چووم و بەڕێم کرد.

گەڕامەوە،ڕێباز لای مەڕێ دانیشتبووکە لە زایینەدا بوو،ببووە مامانی،چاوەڕوانی دەرچوونی بەرخەکە بوو،تەماشامکرد، گوتم: خواگیان، گەر ڕێبازت شێت نەکردایە،ڕێزان دەبوو بە هاوسەری ، تا مردن منداڵەکانیانم بە خێودەکرد،چونکە بە ڕاستی من کەڵکی شووکردنم نییە،کچێتیم لە دەسداوە.لەو کاتەدا نازەنین هاتە حەوشەوە،حەزم نەدەکرد باسەکە بکەم،چونکە نهێنیی بوو،بەڵام دڵتەنگیم پێوە دیاربوو، گوتی:ئەوڕۆ باش ناتبینم، زۆر بێهێزی، بە گاڵتەوپێکەنینەوە گوتی: کاک نەریمان ڕۆیشت،وا بزانم بیری دەکەی.

گوتم: نازەنین،بیر لەو شتانە ناکەمەوە،کەڵکی ئەو شتانەم نییە، خۆتیش نهێنییەکانم باش دەزانی.نازەنین دەستی لە مل کردم گوتی: گاڵتەت لەگەڵ دەکەم، زویر نەبی.

گوتم: لە تۆ زویر نیم ، لە نێوچەوانی خۆم زویرم.

گوتی: لەویش زویر مەبە، با بچین گەوڕەکە پاککەینەوە.کە چووین مەڕەکە زاییبوو،ڕێباز دەستی لە گونی دەدا و سەیری دەکردین و پێدەکەنی و دەیگوت:دادە نەسرین، دادە نەسرین، ها...ها گونی! نێرە، نێر.دڵتەنگی لە بیر بردینەوە،خستینیە پێکەنین،کەوتینە گەوڕ پاککردنەوە.

نەمدەزانی چۆن وەڵامی مەلا ئەحمەد بدەمەوە، بیرم لە خۆم دەکردەوە،بە ڕاستی پێویستیم بە پیاوێ بووکە ببێتە پەرژین بۆ داپۆشینی کەموکورییەکانی ژیانم،لە دڵەوە حەزم دەکرد ببم بە هاوسەری کوڕێکی ڕێکوپێکی وەك نەریمان، چونکە هەڵسوکەوتی بە تەواوی سەرنجی راکێشابووم،دەمزانی کۆمەڵگەکەمانیش ڕێنادا من و شێتەکەی برام، لەگەڵ گەنجێ لە خانوویەکدا بژین، دڵنیام خەڵکی خۆیان ناگرن و قسەمان بۆ هەڵدەبەستن.نەمدەزانی چیی بکەم،چونکە شووکردنەکەم کێشەیەکی گەورەبوو، نەك وەك پرۆژەیەکی پیرۆزی هەموو کچێکی دی.

(٣٢)

ئەو دوو رۆژەی نەریمان، ببووە ساڵێ ، رۆژی دووەم تا نیوەڕۆ لە چاوەڕوانیی بووم، زۆر ترسام نەگەڕێتەوە. لە نزیکی ئێواری چوومە سەربان،تەماشای ئەو رێیانەم دەکرد، ڕووەو گوندەکەمان بوون،لە دوورەوە قەراییەکم بینی،کە پتر ڕوانیم ولێی ووردبوومەوە ،نەریمان بوو.چوومە خوارەوە و رێبازم تێنەگەیان،دەترسام لە خۆشیان بیکا بە هەراوبەزمی خۆی،خۆم لە گێلیدا،بەلاّم هەموو هەستم لای هەنگاوەکانی بوو،دەمزانی چ کاتێ دەگاتەوە نێو ئاوایی،کە گوێم لە دەنگی مەلا ئەحمەد بوو بانگی ئێوارەی دەفەرموو،چووم دەستنوێژم هەڵگرت ،چوومە سەر بەرماڵ،حەزم دەکرد کاتێ نەریمان دێتەوە،من لە سەر بەرماڵ بم،ئەویش لەگەڵ رێباز دانیشتبێ تا لە نوێژ دەبمەوە.ئاگاداری ڕکاتەکانی نوێژ نەبووم،زۆر لە سەر بەرماڵ مامەوە،لە چاوەڕوانی لێدانی دەرگای حەوشە وبەزموشایی رێبازی برام بووم.بێسوودبوو هەر نەهاتەوە، چاوەڕوان بووم ئەو بێتەوە ئینجا خواردنی ئێوارە دانێم،هەر نەهاتەوە،کەوتمە دوودڵییەوە لەو قەراییەی کە لە سەربان بینیبووم،دەمگوت: دەبێ من هەڵە بووبم و نەریمان نەبووبێ!!. حەزمدەکرد بانگی نازەنین بکەم کە شەو بێ لەگەڵمدا بنوێ، گەر لە

ماڵیان بێ یەکسەر پێم دەڵێ،بەلاّم پاشگەزبوومەوە گوتم: با لە چاوەڕوانییدا بم.لەگەڵ ڕێباز دانیشتبووین،لە ناکاو لە دەرگا درا، ڕێباز بە ڕاکردن بۆ دەرگا چوو،هاواروبەزمی ڕێباز بەرزبوەوە، دڵم داچڵەکی،هانی خۆمدا نەشڵەژێم،چوومە لای پەنجەرەکەوە ، سەیرم کرد لەگەڵ ڕێباز باوەشیان لە یەکدیداوە، سەگەکان بە دەوریانەوە کلکە لەقێیانە،ڕێباز بە ڕاکردن هات بەرەو ژوورەکەم و گوتی: دادە نەسرین،دادە نەسرین، کاکە نەریمان هاتەوە،هەر ئەوەندە نەبوو لەخۆشیاندا شێتییەکەی چاکبێتەوە،وایکرد نەریمانم خۆشبوێ. چوومە لای سەماوەرەکەوە و دانیشتم.لە دەرگایدا، فەرمووم لێکرد،شەرمی دەکرد دانیشێ، ئەو ژوورە گەورەیەی لێیبووە کونە مشك،نەیدەزانی لە کوێ دانیشێ،هەر سەیری ڕێبازی دەکرد، تەماشای لای منی نەدەکرد،بەو زستانە ساردە،ئارەقی دەرهێنابوو.پاشئەوەی خێرهاتنەوەم لێکرد و پرسیاری خزمەکانیم لێکرد، گوتم: کاك نەریمان خواردنت بۆ ئامادە بکەم؟

گوتی: نەخێر، لە ماڵی مەلا ئەحمەد نانم خواردووە.

گوتم: وا دیارە لە مێژە هاتوویتەوە؟

گوتی:لەگەڵ بانگدا گەیشتمە گوند، چووم بۆ مزگەوت و لەگەڵ مەلا ئەحمەد هاتینەوە،پێی گوتم: دەبێ لە ماڵی من نان بخۆی.

گوتم:باشە،وابێ با چاییێکت بۆ تێبکەم،بێدەنگبوو، لە چاوەڕوانی چایەکەدا بوو،لەگەڵ چاتێکردنەکە، بە تیلی چاو سەیرم دەکرد، ئاخۆ بزانم تەماشا دەکات،بەلاّم هێند شەرمی

دەکرد،هەر لەگەڵ رێبازدا خۆی خەریك کردبوو. هەر بە پەلە چاکەی خواردەوە ،ئیدی نازانم لە پەلەییا دەمی سووتا یا نا!!

هەستایە سەرپێ و گوتی: زۆر ماندووم، دەچمەوە ژوورەکەم.

رێباز گوتی:مەرمان زایی مەڕ،قۆڵی خستە قۆڵی نەریمان و چوون بۆ لای گەوڕەکە. دیسانەوە لە دەرگا درا ،خۆم چووم دەرگام کردەوە، نازەنین و دایکی نازەنین بوون،زۆرم پێخۆشبووکە هاتن،چونکە حەزم دەکرد کات بڕوا و بزانم زەمانە دەمگەیەنێتە چ چارەنووسێکی دی. هەفتەیێ لە بێدەنگی و شەرمەزاریی بەرانبەر یەکدی،دڵی تەنگکردم. مەلا ئەحمەد جارێکی دی بە نهێنی هات و گوتی: نازانم کچەکەم،رازی بووی یا نا؟چونکە نەریمان دەڵێ، گەر رازی نەبێ، ناتوانم لەگەڵیاندا ژیان بەسەربەرم،چونکە هەردووکمان لەو حەوشەیەداین ،دەزانین چیی لە نێوانماندایە،بە ڕاستی زۆر گرانە بتوانم لە شوانییان بەردەوام بم. مەلا ئەحمەد زانی زۆر شێوابووم و نەمدەزانی چیی وەڵام بدەمەوە،گوتی:سێ رۆژی دیکە وەڵامم بدەرەوە،بە قسەی مامی خۆت بکە، قازانج دەکەی، هەستاو بەرەو مزگەوت ڕۆیشت.زۆر بیرمکردەوە چۆن چارەسەری ئەم کێشەیە بکەم،بڕیارمدا ڕاستی نهێنییەکانم بۆ نەریمان ئاشکرا بکەم،سوێندی بدەم بە گۆڕی شەهیدان،گەر ڕازی نەبوو بە هاوسەرێتییمان، نهێنییەکانم بپارێزێ وجێمان نەهێڵێ،دڵنیاشم نهێنییم دەپارێزێ،چونکە مرۆڤێکی ڕۆشنبیر بوو،سەرەڕای ئەوەی تا ناوەندیی خوێندبوو.

(٣٣)

ئـەو ئێوارەیـە بـەفرێ زۆر باریبوو،گوندەکـەمان تـارای زیـوینی پۆشیبوو، کەشوهەوا زۆر ساردبوو،مەڕەکانیان خستە گەوڕەکەوە و دەرگایـان لێداخـستن.بـۆ یەکـەمجار بـە ڕاشـکاوانە گـوتم:کـاك نەریمان ئەم ئێوارەیە زۆر ساردە،حەزدەکەم هەر سێکمان پێکەوە نـان بخـۆین، کـارێکی تایبەتییـشم پێـت هەیـە. ئـەویش بێبیـانوو هێنانەوە و شەرمکردن ،گوتی: بە چاوان.

پـاش نانخواردن،حەبەکانمـدا بـە ڕێباز،چونکە زۆر مانـدووبوو، گەرمی زۆپاکە تـەواو لەشـی خاوبووەوە،کەروێشکە خـەوی دەکرد. بێئـەوەی شـەرم بکـەم،گوتم:کـاك نـەریمان، تـۆ تـا ئێـستە دوو جـار (مەلا ئەحمەد)ت ڕاسپاردووە بۆ خوازبێنیم.

سەری داخست و گوتی: بەڵێ ڕاستە.

گوتم: من گەر شووبکەم بە هیچ شێوەیێ لە تۆ باشتری ناکەم، بەڵام بڕیارم داوە شوو نەکەم.

گوتی: بۆ شوو ناکەی؟.

گـوتم: چـونکە تـۆ مرۆڤێکـی پاکوبێگەردی،خۆشـم دەوێی،بۆیـە حەز ناکەم یەکێ وەك من بێنی.

گوتی: بڕوا ناکەم لە تۆ پاکوبێگەردتر هەبێ.

گوتم: نەخێر کاك نەریمان، من نهێنییێ یەکجار گەورە هەیە بووەتە کۆسپ و ناتوانم هاوسەریت بکەم،هەر بۆیە دەمەوێ باسی ژیانی خۆمت بۆ بکەم،دڵنیام پاش زانینی بەسەرهات و کارەساتەکانی ژیانم ،پاشگەز دەبیتەوە لە داخوازی کردنەکەت، بەڵام دەبێ سوێندم بە گۆڕی شەهیدان بۆ بخۆی،نهێنییەکانم بپارێزیی ومن و رێباز جێنەهێڵی.

گوتی:بە گۆڕی شەهیدان کە پیرۆزترین سوێندی منە،داواکارییت لە سەرچاوانم، فەرموو باسەکەت بکە.

گوتم:بەم شەوگاری درێژی زستانە، حەزدەکەم خاڵ بە خاڵی بەسەرهاتەکانم باسبکەم،بەڵام بە هیچ شێوەیێ باسەکانم مەبڕە و بێڵە بەردەوامبم تا بە جوانی تێبگەی،من چییم و کێم!!.

تا نیوەشەو،یادەوەرییەکانم بۆ باسکرد، ئەویش زۆر بێدەنگ ببوو،شێوەی تەواو گۆڕابوو، هەستام و چووم بە کلیلی دۆلابە تایبەتکەم،هەر پێنج دەفتەری یادەوەرییەکانم هێنا،دامە دەسی و گوتم: لەوانەیە هێندێ شتم لە بیر چووبێ،دەمەوێ ئەم دەفتەرانە بخوێنیتەوە،سبەینێ تەواوی بکەی و ئێوارێ تۆش دوا بڕیاری خۆت بدەی. ئێستە فەرموو،شەو درەنگیکرد،بچۆرەوە ژووری خۆت وشەوت شاد.

(٣٤)

ئەو رۆژە نەریمان لە ژوورەكەی نەهاتە دەرەوە، لە خوێندنەوەی یادەوەرییەكانم بەردەوامبوو،منیش لە چاوەڕوانیی بووم كە پاش ئەو یادەوەرییە قێزەونانە،چییم پێبڵێ!!. دەبێ خاوەن قسەی خۆی بێ و جێمان نەهێڵێ،زۆر دەترسام،جاروبار زۆر پەشیمان دەبووم لە ئاشكراكردنی نهێنییەكانم،هەر خۆم دەمگوت:با یەكێ دیم بۆ شوانی بهێنایە،چیی زۆرە هەر شوان زۆرە.لە چاوەڕوانی ئێوارە بووم،تا بە زوویی دەفتەری یادەوەرییەكان وەرگرمەوەو لە دۆڵابی تایبەت داینێمەوە، نهێنییەكانی تێدا بپارێزیم

ئێواریێ نزیكبووەوە،مەلا ئەحمەد لە مزگەوت بانگیدەدا، دەستنوێژم هەڵگرت و چوومە سەر بەرماڵەكەم،دەسمكرد بە نوێژكردن،لە نوێژكردندا بووم،رێباز و نەریمان هاتنە ژوورەوە، دڵیان زۆر خۆشبوو،یەكەمجار بوو هەستبكەم نەریمان لە ناخی دڵییەوە گاڵتە بكا و پێبكەنێ،لە دوا ڕكاتی نوێژەكەم سلاوم دایەوە،خێرهاتنەوەم لێكردن،وەلامی دایەوە و یەكسەر دەفتەرەكانی دایەوە دەسم،منیش بە خێرایی وەرم گرت و بە شپرزەیی خستمەوە نێو دۆڵابەكەوە و كلیلمدا،كلیلەكەم خستە

گیرفانمەوە و هیچ قسەم نەکرد، ئەویش بێدەنگبوو. پاش نانخواردن و چاخواردنەوە،گوتم:کاك نەریمان هەموو یادەوەرییەکانت خوێندەوە؟.

گوتی:بەڵێ هەمووم خوێندەوە.سەرم داخست و شەرمەزار بووم کە ئێستە هەموو نهێنییەکانم دەزانێ.

گوتی: دەمەوێ شتێکت پێبڵێم.

گوتم: بەڵێ فەرموو کاك نەریمان.

بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:بڵێ نەریمان.تێگەیشتم ڕازی بووە، ئینجا گوتی:دەزانی تۆ چییت و کێیت؟!! بێدەنگ بووم و هیچم نەگوت،ئەو بەردەوام بوو و گوتی: تۆ بێگەردترین کچی،کچێکی قارەمانی کوردیی،من لێت ناشارمەوە لە ناخی دڵەوە خۆشم ویستووی،بەلام ئێستە لە دڵمدا زۆر لە جاران خۆشەویستری،بە ڕاستی شانازی بە خۆمەوە دەکەم،توانیم کچێکی قارەمانی کورد، کچێکی جوان ،خۆشەویست ،پاکوبێگەرد، هەڵبژێرم و بیکەمە هاوسەری خۆم.تەزوویێ سەراپای جەستەی گرتبوومەوە، بە هێمنییەوە،گوتم: بەلام من کچێتییم لە دەسداوە، چۆن بە من ڕازی دەبی؟!!.

گوتی:نەسرین گیان( بۆ یەکەمجاربوو ووشەی گیان بەکاربێنێ)، (سەیری چاوەکانیم کرد،گوێم لە قسەکانی دەگرت، هەستم دەکرد ئەو نەریمانە نییە، ماوەیەکە بێدەنگوشەرماویی، لەگەڵم دەژیا،ئەمە

(نــەریمان)ێکــی دیکەیــە ونــاخی دڵــی بــۆ کردوومەتــەوە،زۆر خۆشــیدەوێم و مــن ئاگــاداریی ئــەو خۆشەویــستییە بــە تینــەی نییم.هەستمدەکرد خۆشەویستییەکەی نەریمان لێدانی دڵی زیاد دەکردم و ڕەنگیٚ ئاشقانەی پێبەخشیم.بۆ یەکەم جارم بوو یەکیٚ دیم خۆشبویٚ).بەردەوامبوو لە قسەکردن و گوتی: بە پێچەوانەوە، زۆر مرۆڤی ئەم سەرزەمینە لە پێناو خەباتی ئازادیی و مرۆڤایەتیی دژی زۆرداریــی، کەوتوونەتــە ژێــر ئەشــکەنجە و زوڵــم و ســتەمیی زۆردار وداگیرکـەرانی سـەردەمیان،زۆر لـەم ئـازار و بەسـەرهاتانەی تۆیـان بینییوە،ئینجـا بە شـانازییەوە لـە لاپـەڕەکانی مێـژوو باسـی ڕاستییەکانیان کردووە،پێویستە تۆش دەفتەری یادەوەرییـەکان لـە بەندیێتیی نێـو دۆڵابەکـەت ئازادبکـەی و بیکەیتـە ڕۆمـانیٚ تـا بگاتـە دەسـی نـەوەی نـویٚ و داهـاتووی گەلەکـەمان،بۆ ئـەوەی بـزانن ئـەم ئازادییـەی ئەوڕۆ زۆر قوربـانی و خـوێنی لـە پێنـاو ڕژاوە،تەنانـەت کـچانیش لـە پێنـاو ئـەو ئازادییـەدا قوربانییـان داوە،لـەو خەباتـە بێبــەش نــەبوون.بــەم قــسانەی وورەی زۆر بەرزکردمەوە،لــە دڵمــا خۆشەویستربوو.

گـوتم:سوپاسـتدەکەم.بـە ڕاسـتی زۆر هەڵـە بـووم نهێنییـەکانم شاردبوەوە،دڵنیابە وەك ڕۆمانیٚ بڵاوی دەکەمەوە.

گـوتی:مـن سوپاسـتدەکەم،کە دەبیتـە خۆشەویـسترین کـەس لـە ژیانم کە تا ئێستە لێی بێبەری بووم،دەتوانم لە نـاخی دڵـەوە بڵێم،

من تۆم خۆشدەوێ، بەڵام نازانم تۆ منت خۆشدەوێ؟!! یا ڕابردوو کاری بە سەرتەوە ماوە.گوتم: ڕاستە ڕابردوو وەك یادگاریێ دەمێنێ،

بەڵام لە ژیاندا گەر بیرچوونەوە نەبێ بۆ ئەو کەسە خۆشەویستانەی گیانیان سپاردووەو ماڵاوایيان لێکردووین،مرۆڤ ناتوانێ لە ژیان بەردەوام بێ.

بۆ یەکەمجار بوو،بە شێوەیەکی ئاشقانە سەیری بکەم،گەر رێباز لە ژوورەکە نەبوایە،باوەشێکی پاکوبێگەردی خۆشەویستیی، کۆتایی گۆڕینەوەی خۆشەویستیی و باسەکەی ئەو شەوەمان دەبوو.

گوتی:نەسرین گیان، چۆنە هەر ئێستە بچم بە مەلا ئەحمەد بڵێم و هەر ئەم شەو مارەت بکەم.

گوتم:نەریمان گیان پەلە مەکە،با باوە حاجی و کاکە ئەحمەد بێن، خۆت دەزانی چەن بۆ من باش بوونە،دەبێ تۆ دەس بنێیتە نێو دەسی باوەحاجی ئینجا مەلا ئەحمەد مارەم بکات،ماڵی باوە حاجی سەردانیان نزیکبووەتەوە،چونکە بە هۆی بەفربارین و سەرماوسۆڵەوە دوو هەفتەیە دیارنین،هەر کە هاتن کۆتایی پێدێنین،دە ئێستە فەرموو،شەو درەنگیکرد،شەوت شاد وبچۆرەوە ژوورەکەی خۆت.

گوتی:بچمەوە ژووری ساردوسڕ و تەنیایی؟!!.

گوتم: بەم زووانە لە تەنیایی شەوانە رزگارت دەبێ، ئێستە فەرموو،شەو شاد.

دەسی هێنا بۆ تەوقەکردن و پەیمان بەستن،دەسی لەرزۆکمان خستە نێو دەسی یەکدییەوە و پەیمانمان بەست،تیشکی چاوەکانمان گۆڕییەوە،لێدانی دڵەکان خۆشترین ئاوازی خۆشەویستییان لێدەدا. ڕێباز سەیرێکی کرد و زەردەخەنەیەکی بۆ کردین ،هیچ قسەی نەکرد،بەلاّم ئێمە شەرمەزار بووین، شەرممان لە ڕێباز دەکرد، دەسمان لە نێو دەسی یەکدی دەرهێنا، شەو شادی کرد و چووە دەرەوە.

لە پەنجەرەکەوە هەر تەماشام دەکرد،کە گەیشتە دەرگای ژوورەکەی ، ئاوڕێکی لێدامەوە و دەرگای داخست.

(٣٥)

لە چاوەڕوانی ماڵی باوە حاجی بووین,پاش چەن ڕۆژێ،باوە حاجی،ڕێزان و کاکە ئەحمەد بە پیکابەکەیان لەبەر دەرگا وەستان، ڕێباز لە خۆشیاندا بەزم وشایی بوو,باوەشی لە باوە حاجی و کاك ئەحمەد دەدا،ڕێزان کە ڕێبازی بەم شێوەیە دەبینی تەواو بێهیوا دەبوو،دەچووە دەریای خەیاڵێکی قووڵەوە.ئەو ڕۆژە نەریمان دڵی خۆشبوو،چونکە چاوەڕوانیی زۆر بێزاری کردبوو. باسەکەم بۆ باوە حاجی کرد،زۆری پێخۆشبوو، بانگی نەریمانی کرد و گوتی:کوڕی خۆم،ئەمە کچی منە،زۆرم پێخۆشە دەبی بە هاوسەری، هەردووکتان مرۆڤی باشن و لە ئازارەکانی یەکدی تێگەیشتوون،چونکە ئێوە کەسوکارتان ئەنفالکراوە، دەمەوێ هەر ئێستە بچی مەلا ئەحمەد بێنی ونەسرین مارە بکەی.نەریمان بەپەلە چوو بانگی مەلا ئەحمەدی کرد،پیاوانی ئاوایی کۆکردەوە، دەسی لە نێو دەس باوە حاجیم نا و مارەکرام.پاش دوو ڕۆژ مانەوەی ماڵی باوە حاجی ،نیوەڕۆی دووەم ڕۆژ مەڕمان سەر بڕی و خەڵکی گوندمان بانگێشت کرد.ڕێزان و نازەنین منیان ڕازانەوە،لە پاش عەسر،باوەحاجی هات بۆ ژوورەکەم و گوتی:کچەکەم ئێمە دەڕۆین چونکە درەنگمان پێچووە و خونچە چاوەڕوانە،دەسی باوە حاجیم ماچکرد.بە ڕۆیشتنیان زۆر گریام، نەمدەزانی بۆ دەگریم!! ئەو ئێوارەیە ژوورەکەم بووە کەژاوەی هاوسەرێتیی وخۆشەویستیی من و نەریمان.

(٣٦)

پاش چەن ساڵێ، ڕێبازی برام بووە خاڵۆی چوار منداڵ، (دوو کچ، دوو کوڕ)، ناوی منداڵەکانمان بە ناوی کەسوکاری من و نەریمانەوە دەنا،باوەشی خۆشەویستییمان بۆ کردبوونەوە, بووم بە دایك، بە سۆزترین دایك بۆ چوارجگەرگۆشەی پاکوبێگەرد، بەڵام ئاهی ڕێباز لە دڵمدا دەرنەدەچوو،زۆر دکتۆرمان پێکردبوو هیچ چارەسەری نەبوو.

رۆژێکیان گوتی: دەزانن خەونم بە باوك و دایکمەوە بینیووە، فرمێسك لە چاوەکانیدا دەباری،هاواری دەکرد،دایکە گیان، باوکە گیان ئێوە لە کوێن،بۆ خۆتان لێشاردومەتەوە؟!! ئێمەیشی کردە گریی،چونکە زۆربە سۆز و تامەزرۆوە داوای دایە و باوەی دەکرد.

نەریمان گوتی: نەسرین گیان دەزانی ڕێباز بەرەو چاکبوونەوە دەچێ،چونکە ساڵانێکە ئەشکم لە چاوانیدا نەبینیووە، ئێستە بیردەکاتەوە بۆیە دەگری.

گوتم: نەریمان گیان،حەزم دەکرد چاکبێتەوە،بەڵام بڕوا ناکەم، چونکە گریان و هاوار کردنەکەی،هاواری ناخۆشیی و بێزاربوونی چاوەڕوانییە.چاوەڕوانی چارەنووسیی ئەنفالکراوان وای لە

شێتێکی وەك ڕێبازی برام کردووە،بڵێ دایە و باوە ئێوە لە کوێن؟. نەخوازەڵا ئێمە و چەندین هەزار وەك ئێمە، چاوەڕوانیی چاوەکانی کزکردووین، زۆربوونی پروپاگەندە، گوێیەکانی کاسکردووین، داخورپانیی دڵەکان، چەندین دڵی وەستان.

هەر لەوێدا بڕیارمدا،یادەوەرییەکانم بە زووترین کات بڵاوکەمەوە و ئاشکرای بکەم تا بزانرێ بیابانەکان شوێنی گۆڕی بە کۆمەڵی ئەنفالکراوانن،دەمی شۆفەڵەکانی ڕژێم بە لمی بیابان، گوێ،لووت،دەم و چاوە گەشەکانی منداڵ ،ژن ، پیر و پەککەوتە و لاوەکانی سواخداوە.هەر بە ناوی یادەوەرییەکانمەوە، ڕۆمانەکەم بڵاودەکەمەوە، تا نەوەکانی نوێ و داهاتوومان، بزانن مانای ئەنفال چییە، چ کارەساتێ شوومیی بە سەر گەلەکەماندا هێناوە.

کۆتایی

